# پیرۆزبایی

بە ناوی بەڕێز خاوەن ئیمتیازو بەڕێوەبەرو ستافی کارای

گۆڤاری بڕیارەوە، چەپکە گوڵی پیرۆزبایی پێشکەش بە بەڕێز

## د.عادل محەممەد شێخانی

سەرنووسەری (گۆڤاری بڕیار) دەکەین، بە بۆنەی وەرگرتنی

بڕوانامەی (دکتۆرا) لە بواری خوێندنی ئیسلامیدا، بە ناونیشانی:

(أَدَبُ الرَّد على المُخالف عندَ أهل السُّنة والجَماعة)

بە پلەی **زۆرباشە**،

سەرکەوتنو سەرفرازیو تەمەندرێژی بۆ خزمەتی

گەلو نیشتمان بە ئاوات دەخوازین،

خودای گەورە نموونەیان زۆر بکات.



No: 85

**خاوەنی ئیمتیاز**

ئەندازیار:

مەسعوود تاهیر ڕۆژبەیانی

**سەرنووسەر**

د. عادل محەممەد شێخانی

sarnosar@yahoo.com

**بەڕێوەبەری نووسین**

بەرزان ئەبوبەکر

**دەستەی نووسەران**

ئەسکەندەر ڕەحیم

بێگەرد فارس

زاهیر زانا

محەممەد مێرگەیی

محەممەد هاشم محەممەد

وەهاب حەسیب

یەحیا محەممەد

گوڵان حەمەئەمین

**ڕاوێژکاری یاسایی**

پارێزەر:- ئازاد محێدین

**بەشی هونەرکو دیزاین**

پشتیوان عبدالرحمن

**تایپ**

کەلسوم جەلال



**ناونیشانی گۆڤار**

سلێمانی - شەقامی سالم -تەلاری جەمالی حاجی عەلی-
نهۆمی چوارەم- یەکەی (٤٠١) نزیك پردی خەسرەو خاڵ
٠٧٤٨٠١١٢٧٨٧ - ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢

هەولێر

٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠ - ٠٧٥٠٠٥٢٥٣٠٣٥

E-mail: bryarmagazin@gmail.com





bryarmagazine


**دابەشکردن**

کۆمپانیای پەیك/ 07708649210

**چاپ**

کۆمپانیای پیرەمێرد

نرخ 2500 دینار




# بڕیار

مانگانه‌یه‌کی تایبه‌ته به کارگێڕیو گه‌شه‌پێدانی مرۆیی

سالٌی هه‌شته‌م - ژماره 85 - ته‌مووزی 2015










## کارگێڕی و بازاڕسازی




رمضان كريم

RAMADAN





# میوانی ڕۆح

بەتاسەی دیدارت ڕۆحی شەکەتو ماندووم لە دووریانی هاتو نەهاتی تۆدا چاوەڕێ بوو، هەموو ساڵێ دەترسم نەگەمە دیدارت، دڵـە خورپەمە تـا ئەو ئێوارەیـەی کە بە هیلالی درەوشـاوەت دیوەخانی دڵم ئاوەدان دەکەیتەوە! ئۆخەی ئازیزم ئۆخەی!

وا ئەمجـارەش هاتمەوە حزوورتو بە دیدارت شـادو شـکور بوومەوە!

جارێکی دی ئاوێزانی نوورو غەرقی باوەشی چرا بووم!

تۆ ئێسـتا میوانـی ڕۆحە شـەکەتو ماندووەکەمی، شـنەی ڕەیانو خوناوی کەوسەرو عەبیری فیردەوسی!

هاتـووی بـە دڵۆپـە میسـکی لێـوی ئەویندارانـی خـودا، گوڵاوپرژێنی هەموو جیهان بکەی!

هاتـووی بە زمانی پاراو، بـە تیلاوەی قورئانو زیکرو یادی خـوداوە، سـروودی میهرو خۆشەویسـتی بۆ هەمـوو مرۆڤەکان بچڕی!

هاتووی؛ تا دەرگاکانی گوڵخەن دابخەیو دەرگاکانی گوڵشـەن بخەیتە سەر پشت!

هاتـووی؛ تا بانگمان بکەیتە سـەر سـفرەو خوانـی تۆبەو گەڕانەوە بۆلای خودا!

هاتـووی؛ تا بمانکەیتـە میوانی ژوانی ئیلاهیو شـەوچرای ماڵەکانی خودا.

هاتـووی؛ تا جارێکـی دی ناسـنامەی مرۆڤبوونـی خۆمان بدەیتەوەو بگەڕێینەوە جیهانی مرۆڤ!

هاتـووی؛ تـا نوێتریـنو گەورەترین وانەی ئەوینو تاسـەو سووتانمان فێر بکەی!

هاتـووی؛ دڕ بـە تاریکیـی دەیجوور بدەیو دەسـت بنێیتە قورگی ئەهریمەنەکان!

بـە پەرداخە ئاوێکـی کەوسـەریو بە دەنکـە خورمایەکی بەهەشـتی، تاڵـیو مەینەتـی ئـەم زەمەنـە دژوارەمـان لەبیر دەبەیتەوە!!

پەیامی میهری، لە زەمەنی دڕندەیی مرۆڤەکاندا!

بەخشندەییو سۆزی لە زەمەنی بێبەزەییو ستەمکاریدا!

باوەشی گەرمی لە سەردەمی حیرمانو بێنەواییدا!

نەرمەبارانی میهری ئیلاهیت، پرووشەی سۆزی پەروەردگاری، سایەی پشوو، سیڤانی ڕۆحی!

چی دەستێکی ئەفسووناویت!

لە چاوتروکانێکدا، شار پڕ دەکەی لە مرۆڤ!!

ماڵەکان پڕ دەکەی لە شـەربەتی مێوژو شـیرینیو خواردنی خۆش.

کۆڵانەکانمان دەکەی بە چراخان.

لێوەکان خەندەباران دەکەی!

ناچارم وەکو هەژارێکی بێنەوا!

منداڵێکی بێباوک

کیژۆڵەیەکی دڵشکاو

گەنجێکی بێناز بسووتێم بە تاسەی دیدارت!

چونکـە ئەوەی لەگـەڵ هاتنی تـۆدا دەیبینـم، هەرگیز لە مانگەکانی تردا چاوم پێی ناکەوێ!

بەخێر هاتی ئەی میوانی ڕۆحم.....

ئەی پەیامنێری ئاشتبوونەوەی خودایی.

# کارگێڕی بە گوفتار

هەر قوتابییەک سەرەنجام لە مامۆستاکەی شارەزاتر نەبێت، قوتابییەکی بێکەڵکە..

**لیۆناردۆ داڤینشی**

تینوێتیی دڵ، بە دڵۆپە ئاوێک دانامرکێتەوە!

**سەعدی شیرازی**

هەر کەس باوەڕی وەها بێت، کە سەروەتو سامان هەموو شتێکە، ئەوا هەمووشتێک دەکات لە پێناویدا!

**نەزانراوە**

ئەو کەسەی لەبەر مەبەستو هۆکارێک خۆشی بوێیت، لە کۆتاییدا ڕقی لێت دەبێتەوە!

**پەندێکی عەرەبی**

هەنگ چێژ لە هەڵمژینی شیلەی گوڵان دەبینێت، گوڵەکانیش چێژ لە بەخشینی گوڵاوەکانیان دەبینین بە هەنگەکان، کەواتە: هەنگو گوڵ پێکەوە لەم دانووستانە چێژ دەبینن؛ چونکە ژیان بەخشینو وەرگرتنە.

**نەزانراوە**



# تەنها هەوڵ بدە!!



ساڵی ۲۰۰۸، کە خەریکی گەڵاڵەکردنی بیرۆکەی بڕیار بووین، دەمویست بڕیار بە گەورەیی لەدایك بێت، هەوڵم دا لە هەموو ڕوویەکەوە جیاواز بێت، چی وەکو ناوەڕۆك، چی وەکو دیزاینو چاپ، ئارەزووم دەکرد پەیوەندی بە باشترین دیزاینەرەوە بکەم، لەگەڵ کەسانی شارەزادا ڕاگۆڕکێ بکەم، سەرەتا دیزاینی لۆگۆی بڕیارو چەنـد لاپەڕەیەکی بڕیاریش، لەلایەن دیزاینەرێکی جەزائیرییەوە ئەنجام درا!

دواتر دوای گەڕانێکی زۆر، لەسـەر تـۆڕی ئینتەرنێت بە کۆمپانیایەکی کارگێڕیی بەناوبانگ لە ئوردون ئاشنا بووم، کە ناوی کۆمپانیای "شعاع" بوو، لە ساڵی (۱۹۹۲)ە دامەزرابوو، لە زۆربەی وڵاتانی عەرەبیشدا لقی هەبوو!

ئەم کۆمپانیایە، وێڕای کۆمەڵێ پرۆژەی گرنگ، بە درێژایی سـاڵ خولی زۆر گرنگیان هەبوو، هەروەها خاوەنی ئەرشیفێکی کارگێڕیی زۆرباش بوون، کە دەتوانی بە بەشداربوونی ساڵانە، سوودی لێوەربگریت!

حەزم دەکرد هەم بەشداریی ساڵانە بکەمو هەم بچمە خولەکانیان، بەڵام ئەو کات من سـکرتێری کۆمپانیای قەیـوان بووم ، توانای ماددیم زۆر لاواز بـوو، لەبەرئەوەی کە بیرۆکەی چوونە دەرەوەشـم لە مێشـکم وەدەرنابوو، دوای بەسەرچوونی پاسپۆرتەکەم، نوێشم نەکردبۆوە!!

بەڵام دەسـتبەرداری حەزەکەم نەبووم! پەیوەندیم پێوە کردن، سەرەتا بۆ بەشـداریی سـاڵانە لەپێگەی کۆمپانیاکەدا! پێیان گوتم بۆ نایەیت ببیت بە بریکاری ئێمە لە عێراق!

منیش گوتم: ئەی بۆ ئێوە شتێکم بۆ ناکەن؟

گوتیان: چی؟!

گوتـم: بەشـداری بێبەرامبەرم پێ بدەن لە خولـی (T.O.T) ڕاهێنانی ڕاهێنەران، منیش دێمە ئەوێو قسە لەسەر وەرگرتنی وەکالەتیش دەکەین!

یەکسەر ڕازی بوون!

بەڵام ئەی نرخی بلیتو ئوتێلو خەرجی سەفەر؟!

ڕۆژی بەشـداریی خولەکـە (۲۰۰۸/۳/۲٤)و ئێسـتاش وەك بیرم بێ (۱٥-۲۰۰۸/۳/۱٦)ـە، چۆن بەم پەلەیە پاسپۆرت دەربکەم؟!

بەڵام ئەو کارە، بۆ من زۆر گرنگ بوو!

کاتێکیـش کارێکـت بەلاوە گرنگە، دەبـێ لە پێناویـدا هەموو هەوڵت بخەیتە کارو ئامادەی هەموو قوربانییەك بیت!

سەرەتا داوای مۆڵەتم لە شوێنی کارەکەم کردو ڕەزامەندیم وەرگرت، بۆ خەرجی سەفەرو پاشان بڕی پارەی وەرگرتنی وەکالەتی کۆمپانیا، پەیوەندیم بە هاوڕێو برای بەڕێزم (کاك محەممەد هاشـم)ەوە کرد، ئەویش پەیوەندی بـە خاوەن ئیمتیازەوە کرد؛ (ئەندازیار مەسـعوود ڕۆژبەیانی)، کە ئەوسـا، هێشتا بڕیار لەدایك نەبووبوو!

جێگای ڕێزو سوپاسە، کە بەڕێزیان ئامادەیی تەواویان پیشان دا، لێرەدا تەنها مەسەلەی پاسپۆرت مایەوە!

بەڵام کات زۆر درەنگ بوو، چەند ڕۆژێکی کەم مابوو، بۆ کاتی سەفەرو زەحمەت بوو؛ بەو پەلەپەلە پاسپۆرت دەربکرێ، بەڵام سوپاس بۆ خودا من کۆڵم نەدا!

پەیوەندیـم کرد بـە برایەکی بەڕێزەوە، ئەویش کارئاسـانی بۆ کردمو ڕۆژی (۲۰۰۸/۳/۱۹)، زۆری نەمابوو کە پاسپۆرتەکەم لە باخەڵ بنێم، بەڵام لە پڕ دوو کێشەم هاتە پێش!

یەکەم: کۆبوونی خۆراکم ژمارەی لەسەر نەبوو، نووسراویان بۆ کردم بۆ بەڕێوەبەرێتیی دابەشکردنی خۆراك بۆ ئەو مەبەستە.

دووەم: نفووسەکەم نووسرابوو سلێمانیو ڕەگەزنامەکەم نووسرابوو کەرکـووك! لەوانەیـە بڵێن جـا ئەوانە کـەی کێشـەن؟ هەردوکیان چارەسەریان هەیە!

بەڵام خۆشەویستان ئەی نازانن کە (۳/۱۹) دوا ڕۆژی دەوام بوو، بۆ ماوەی ۳ ڕۆژ دەوام دادەخرا بەهۆی نەورۆزەوە!!

منیش ئەگەر ئەو ڕۆژە تەواوم نەکردبا، ئیدی پاسپۆرتم بۆچی بوو؟!

لەوێشـدا تەسـلیم نەبووم، برایەکم نارد بۆ بەڕێوەبەرێتیی دابەشکردنی خـۆراكو خۆشـم بە پەلە چـووم بۆ چەمچەماڵ بۆ یەکخسـتنی تەسـکەرەو ڕەگەزنامەکەم، کاتیش درەنگەو تا ئەو کارانەم کرد، کات گەیشتە (۱۲)ی نیوەڕۆ!

کاتێك گەڕامەوە، گوتیان کاتی پشـوودانە بـە مۆلیدەکانو لە ۱۲ بۆ ۱ی پاش نیوەڕۆ کۆمپیوتەرەکان دەکوژێنەوە!! ئەوسا کارەبا وەك ئێستا نەبوو!!

چاوەڕوانـم کرد، تا کاتـی هاتنەوەی کارەباو لە دوا سـاتەکانی کۆتایی دەوامی ڕۆژی (۲۰۰۸/۳/۱۹)دا پاسپۆرتیشم وەرگرتو ئیدی خۆم ئامادەکرد بۆ سەفەرو ڕۆژی (۲۰۰۸/۳/۲۳) سەفەرم کرد بۆ عەممانی پایتەختی ئوردون.

لە عەممان:

۱- بەشـداری خولی پیشکەوتووی (T.O.T)م کرد بۆ ماوەی (٥)ڕۆژ، کە ئـەوکات ئەگەر یەکەمین کـەس نەبووبم، ئەوە لە یەکەمینەکانی هەڵگرانی ئەو بڕوانامەیەم وێڕای خولێکی خێرا بەناوی "التمتین" پتەوکردن.

۲- وەکالەتی کۆمپانیای "شـعاع"م وەرگرتو بڕیار بوو بە بریکارو ناوی لەسەر بەرگی گۆڤارو بڵاوکراوەکانی ئەو کۆمپانایە تۆمار کرا.

۳- چووم باشـترین کۆمپانیای دیزاین، کە ناوی "دارالفن"ەو لای ئەوان دیزاینی گۆڤاری بڕیارم کرد.

٤- بـە ئاشـنابوونم بـە کۆمەڵێك کەسـی پسـپۆڕ، وێـڕای وەرگرتنی ئەرشیفێکی گەورەی هاردوێر لەو کۆمپانیایە کە لە گۆڤارو کتێب پێکهاتبوو، پێگەیەکی بەهێزم بۆ بڕیار درووست کرد!

دوای نزیکەی مانگێك، یەکەمین گۆڤاری کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی لە کوردستاندا چاوی هەڵهێنا!

دوای سوپاسـی خـودای گەورەش، ڕێزو سـوپاسو شـکۆداری بۆ بەڕێزان خاوەنی ئیمتیاز، (ئەندازیار کاك مەسعودڕۆژبەیانی) و (کاك محەممەد هاشم)و مامۆستا (بەرزان ئەبوبەکر) کە لەسەر دەستی ئەوان، بڕیار لەدایك بوو.

ئێوەی بەڕێزیش دەتوانن لەم چیرۆکە واقیعیەوە زۆر شت فێر ببن!

# تەنها بۆ سەرکردەکان

ئەوماڵەی مریشك تێیدا کاری کەڵەشێر دەکات،
سەرەنجام دەبێتە ماڵێکی وێرانە.

(پەندێکی چینی)

سەرکەوتن، سەرکەوتن ڕادەکێشێت، هەروەکو چۆن
پارەو سامان، پارەو سامان ڕادەکێشێت.

(شامفۆر)

هەندێکمان بە هۆی زیرەکییەوە سەردەکەوین،
هەندێکیشمان بە هۆی نەزانیی کەسانی دیکەوە سەردەکەوین!

(لابرۆییر)

ڕەنگە قامچی مرۆڤ ناچار بە ئەنجامدانی سەختترین کار بکات،
بەڵام ناتوانێت ناچار بە داهێنانی بکات.

(شولام ئاشی)

زمان بەرگەی ڕووبەڕووبوونەوەی ناڕەحەتییەکان دەگرێت؛ چونکە تەنیکی نەرمە، بەڵام ددانەکان
بەرگەی ناڕەحەتییەکان ناگرن و هەرزوو خۆیان بەدەستەوە دەدەن؛ چونکە تەنیکی ڕەقن!

(نەزانراوە)

# 10 ڕێگا بۆ ئاخاوتنو قسەکردن بەرامبەر گوێگرانو ئامادەبووان..

و: هەژار عەبدوڵلا وەرتی

بەبێ ترس، وەکو کەسە پیشەگەرەکان، بەرامبەر خەڵك قسە بکە.

قسەکردن بەبێ ترس، بەرامبەر گوێگرانو ئامادەبووان، پێویستی بە ئەزموونی ژیانو ڕاهێنانو ئامۆژگاری هەیە، زۆرێك لە ئێمە، کاتێك ڕووبەڕووی کۆمەڵە خەڵکێك دەبینەوە، تووشی زمانگیرانو متمانەبەخۆنەبوون دەبینەوەو ئارەق دەکەینەوە، ئەم جۆرە کەسانە، کاتێك قسە بۆ بەڕێوەبەرەکەیان دەکەن، هەست بە سەرماو لەرزین دەکەن، دەموچاویان سوور دەبێتەوەو لێدانی دڵیان خێرا دەبێت.

دکتۆرە (هیبە عیسەوی) مامۆستای دەروونپزیشکی لە زانکۆی (عەین شەمس)، **10** ڕێگاو ئامۆژگاریو خاڵی پێشکەش بەو کەسانە کردووە، کە تووشی ئەو ترسانە دەبن، ئەوانیش:

**١ـ شڵەژانو ئاڵۆزیی دەروونی، شێوازێکی چەماوەو بازنەیی وەردەگرێت:** کە پێش پێشکەشکردنی وتە، یان وتارەکە دەست پێدەکات، بەرەو زیادبوون دەچێت، تاکو دەگاتە لوتکە لە ساتی دەستپێکردنی پێشکەشکردنی وتەکەو دواتر پاش نزیکەی **2** خولەك لە بارودۆخی ئاساییداو بەبێ هەوڵدانێکی زۆر لەلایەن قسەکەرەکەوە، لا دەچێتو نامێنێت. بۆیە زۆر گرنگە، کە مرۆڤ بزانێت کە نیشانەکان زۆر زوو لەناو دەچنو لە ماوەی چەند خولەکێکی خێرادا، هەوڵی کۆنترۆڵی هەستەکانی بدات.

**٢ـ دڵنیابە کە ئامادەبووانو گوێگرانت ئەو شتە نازانن، کە تۆ دەیزانیت:** هیچ پێویست بە شڵەژان ناکات؛ چونکە ئامادەبووان ئەو زانیارییانە نازانن، کە لای تۆ هەیە. کەواتە: تۆ بەهێزتریتو زیاتر زانیاریت هەیە. ئیدی ترس وەلا نێو بەمتمانەوە قسە بکە.

**٣ـ پێویستە لەسەر قسەکەر گومانی خراپ بەو خەڵکەی بەرامبەری نەبات:** دڵنیابە کە بەرامبەرەکانت نایانەوێت بەدوای هەڵەکانی تۆدا بگەڕێنو ئەگەر گفتوگۆیەك ڕوویدا لە نێوان تۆو ئامادەبووان، واتە: سەرکەوتنی بیرۆکەکان لە پێشکەشکردنت جیاوازە، پێویستی بە گفتوگۆ هەیەو هیچ پێویست ناکات لە بۆچوونەکانی ئامادەبووان بترسیت؛ چونکە ئامادەبووان هیوای سەرکەوتن بۆ تۆ دەخوازن.

**٤ـ خۆئامادەکردنی باش بۆ وتارەکە پێش پێشکەشکردنی بۆ ماوەیەکی تەواو:** پێویستە لەسەر قسەکەرەکە باش خۆی ئامادە کردبێت؛ چونکە خۆئامادەکردنی باش، ڕێژەیەکی گەورە لە شڵەژان لا دەبات؛ چونکە ئەو کەسەی بابەتو بیرۆکەکانی، بە دووبارەکردنەوەی چەندین جار ئامادە دەکات، بەئاسانی لە کاتی پێشکەشکردندا قسە دەکاتو لای ئاسایی دەبێتو متمانەی بە سەرکەوتنی زیاد دەبێت.

**٥ـ پێویستە ڕاهێنانی باش بکرێ پێش پێشکەشکردنی وتەکە:** بەرامبەر ئاوێنە، چەندین جار خۆت تاقی بکەرەوە، دەبینیت کە هەست بە دڵنیایی دەکەیتو ئەگەر هەستت بەمە نەکرد، بڕۆ بۆ ڤۆناغێکی پێشکەوتووتر، بەشێوەیەك وێنەی ڤیدیۆیی خۆت بگرە بە کامێرای ڤیدیۆ، یان مۆبایل.. دوای تەواوبوونت، دووبارە شریتەکە لێبدەوە؛ بۆئەوەی خۆتو پێشکەشکردنەکەت ببینیت. سەرەنجامیش بەو کارە، هەست بە متمانە دەکەیت.

**٦ـ مەشقو ڕاهێنانی هەناسەکێشان:** هەناسەیەکی قووڵ هەڵبمژە لە لووتەوەو هەناسەت ڕابگرە بۆ ٣ چرکە، دواتر لە دەمەوە بیکەرە دەرەوە، ئەم هەناسەدانە، ٣ جار پێش هەر چالاکییەك ئەنجام بدە؛ چونکە کار لەسەر کەمکردنەوەی ئاڵۆزیو شڵەژان دەکات. بۆیە دەبینی شڵەژانەکەت، بە ڕێژەیەکی زۆر کەم دەبێتەوە..

**٧ـ خوێندنەوە لەسەر لاپەڕەی بەردەمت:** لێرەدا تێبینییەکی گرنگ هەیە، پێویستە بەهەند وەربگیرێت، ئەویش سووربوونە لەسەر خوێندەوەی وتەکەت، بەڵام دەبێت نووسراوەکەت، لەسەر مێزی وتاردان، یان ئەو تەختەی بۆ دانانی کاغەز درووستکراوە دابنێیت، نابێت کاغەزەکە، بە دەستەوە بگریت؛ چونکە لە خولەکەکانی سەرەتادا، دەستەکانت دەلەرزێتو ئەگەر تێبینی لەرزینی دەستەکانت کردو قسەت دەکرد، ئەوا شڵەژانەکە زیاتر دەبێتو خەڵکو ئامادەبووانیش، ئەگەر لێتەوە نزیك بن، هەستی پێ دەکەن!

**٨ـ بەکارهێنانی زمانی لاشە بەشێوەیەکی ئاسان:** کە دەکرێت هەردوو دەستو دەموچاو بجوولێنرێت، بەڵام پێویست بە زیادەڕەوی ناکات.

**٩ـ هەناسەوەرگرتنو دانەوەت ڕێکبخە:** بەشێوەیەك چەند چرکەیەك بوەستە بۆ هەڵکیشانی هەناسە؛ چونکە بەردەوامبوون بەبێ هەناسەوەرگرتنو هەناسەدانەوەی تەواو، کەسەکە هەست بە شڵەژان دەکات. هیچ نەنگیش نییە، چەند پەرداخێکیش ئاو بخۆیتەوە، تاکو قسەکانت، لای ئامادەبووان درووست بن.

**١٠ـ بەردەوامبوون لە وتاردان:** بۆ زاڵبوون بەسەر شڵەژان لەکاتی قسەکردندا بۆ ئامادەبووان، تاکە ڕێگا بریتییە لە: ڕووبەڕووبوونەوەی ترسەکانو بەردەوامبوون لە قسەکردن؛ چونکە دوای چەند خولەکێك لە قسەکردن، شڵەژانەکان ون دەبن.

لە کۆتایی ١٠ هەنگاوەکەدا، دکتۆر (هیبە عیسەوی) جەخت لەوە دەکاتەوە، کە ئەو شڵەژانەی کەسەکە هەستی پێ دەکات، بۆ ئامادەبووان دەرناکەوێت، بەڵکو ئەوە بریتییە لە: نیشانەی ناوەکیو ڕواڵەتی دەرەکی نییە، بۆیە دڵنیابەو پشت بە خودا ببەستە، ئیتر سەر دەکەویت بەسەر ئەو ترسانەدا.

سەرچاوە: JBC NEWS

ن: د.طارق السويدان

و: فێنك جەمال

# چەند ئامۆژگارییەك بۆ وتاردانو نووسین

١- پێش ئەوەی دەست بکەیت بە کۆکردنـەوەی زانیاری، ئامانجەکەت دیاری بکە.

٢- زۆرترین زانیاری لە خەڵکی وەربگرەو بیخەرە سەر شارای زانیارییەکانی خۆت.

٣- هەرگیز یارمەتییەکانی دەوروبەر ڕەت مەکەرەوە.

٤- با هەموو زانیارییەکانت بەرهەمی یەك سـەرچاوە نەبن (وەکو تەنها کتێبێك، یان گۆڤارێك)، بەڵکو لە ئینتەرنێتیشدا بگەڕێو پرسیار لە کەسانی شارەزاش بکە.

٥- هەموو شتەکانی ناو سەرچاوەکە دەرمەهێنە، بەڵکو تەنها سوود لەو شتانە ببینە، کە پەیوەندییان بە بابەتەکەتەوە هەیە.

٦- زانیاریو ئاماری کۆن بەکار مەهێنە (گەر تازەشت دەست نەکەوت، هەر زانیاریی کۆن بەکار مەهێنە).

٧- شـتێك مەنووسـە، یـان مەڵـێ، کە خۆت بە باشـی لێی تێناگەیت.

٨- زانیارییەك بەکار مەهێنە، کە لێی دڵنیا نیت.

٩-شتێك مەڵێ، یان مەنووسە، کە نازانیت کێ خاوەنەکەیەتیو سەرچاوەو مێژووی نووسینەکەی نازانیت.

١٠- ئـەو وتـەو چیرۆکانە بـەکار بهێنە، کـە پەیوەندی بە بابەتەکەتەوە هەبێت.

١١- هـەوڵ بدە زیاتر چیرۆکی ڕاسـتەقینە بەکار بهێنیت، تا چیرۆکی ئەفسانەیی.

١٢- نوکتە کەم بەکار بهێنەو گەر بەکاریشت هێنا، با گونجاو بێتو هەرگیز با لە سەرەتادا نەبێت.

١٣- ئاماری گونجاوو سەرنجراکێش بەکار بهێنە.

١٤- زانیاریی بەهێز بەکار بهێنە لەسەرەتادا؛ تا بە پەرۆشەوە ئامادەی ناوەڕۆك بن.

١٥- هەمـوو ١٥ خولـەك جارێك، بابەتی سـەرەکی بڵێرەوەو هەموو وتەکان ببەستەرەوە بە بابەتی سەرەکییەوە.

١٦- گرنگـی لەوەدا نییە، زۆرتریـن زانیاریت هەبێت، بەڵکو گرنگی لەوەدایە، گرنگترین زانیاری بخەیتە ڕوو.

١٧- ئامانجـی بابەتەکـەت بزانەو بیـرت نەچێت بەو جۆرە بێـت، کە لەگەڵ ئامادەبووانـدا ڕێك بکەوێت، هەموو کەسـێك لە کەسـێکی دیکە جیاوازە، تایبەتمەندیش ئەو جیاوازییەیە، بۆیە لاسایی کەس مەکەرەوە.

١٨- لە پێدانی زانیاری لەبارەی وتارو زانیاریی تەکنیکییەوە، زۆر ورد بە.

١٩- بـۆ ئـەو خاڵانـەی کـە ڕوون نیـنو ئاڵـۆزن، هۆکاری ڕوونکەرەوە زۆر بەکار بهێنە.

٢٠- زۆر گرنگـە بـۆ ئامادەبـووانو خوێنـەران، وا خـۆت دەربخەیـت کە تۆش مرۆڤێکـی وەکو ئـەوان، چەندین خەونو ئاواتت هەیەو چەند تووشی ململانێو تەحەدیات دەبیتەوە، ئەمە هاوڕێیەتیتان زیاتر دەکات.

یەکەمیـن پەرتووکـی هونـەری دەربڕین، هی ئەرسـتۆیە بەناوی (وتاردان)..

ئایـا دەزانیت، کە سـاڵانە لـە ئەمەریـکادا، ٥ ملیۆن وتار پێشکەش دەکرێت، ملیۆنێکی تایبەتە بە پیاوانی بازرگان؟

# پەیکەری
# حوکـــمڕانی



بەشی دووەم

سامان کەریم

## پایەی دووەم: دارایی و ئابووری

گریمـان حکومەت پلانێکـی بەهێزو تۆکمـەی هەیە، بەڵام لەگـەڵ بوونی ئەم پلانە بەهێزەدا، بودجەی پێویسـتمان دەوێت بـۆ جێبەجێکردنی هەر پلانێك. هەروەها دەبێت چەندی بودجە بوێـت بۆ جێبەجێکردنی، دابین بکرێت؛ بۆئەوەی پلانەکە بەبێ کەموکـوڕی بەئەنجـام بگەیەنرێت. واتە: گەر پلانێکی باشـیش بوونـی هەبێت، بەڵام بودجەی باشـت نەبێت بـۆ ئەنجامدانی، ئـەوا بەتەنها بوونی پلانەکە سـوودێکی وەهای نابێت؟! دارایی‌و ئابووریی هەر وڵاتێکیش لە چەند سـێکتەرێك پێکهاتووە، بەڵام دارایی‌و ئابووریی لای ئێمە، بریتییە لەم بەشانەی خوارەوە.

- داهاتی سـەر سـنوورەکان، کە گومرگو باجی سەرسـنوور دەگرێتەوە.
- داهاتی بەڕێوەبەرایەتییەکان، کە پێکدێت لە (کارەبا + ئاو + هاتوچۆ) لەگەڵ چەندین بەڕێوەبەرایەتی دیکەدا.
- بازرگانی‌و پیشەسازی.
- بەشە بودجەی داهاتی لە سەدا ١٧٪ی حکومەتی عێراق.
- داهاتی سامانە سرووشتییەکان‌و گرێبەستی نەوتی.

بەڵام کێشـەکە ئەوەیە ئێستاشـی لەسەر بێت، هیچ یەك لەم داهاتانـە، نازانرێـت بڕەکەی چەندە؟ نازانرێـت خەرجییەکانی ئەم سـێکتەرانە چەنـدە؟ تاکو بزانین سـاڵانە چەندمان داهات هەبووە؟ واتە: داهاتێکی ناڕوون‌و ناشەفافمان هەیە، کە لەداهاتی ناڕوونیشدا، ناتوانین پلانی بەهێز دابڕێژین.

دیسان دەپرسینەوە، ئایا لەم هەرێمەی ئێمەدا، ئابوورییەکی باش بوونی هەبووە؟ ئەم جارە بەڵێ، بەڵام چ ئابوورییەك؟ ئابوورییەکی لێڵ‌و بێمانا، وەك لەسـەرەوە ئاماژەمان پێدا، کە تائێستـاش کەس نازانێت بەشـەکانی ئابووریی ئێمـە، داهاتەکەی چەندە؟ هەروەها لەسـێکتەری ئابووریدا تەنها سـێکتەرێکمان گرتـووەو گرنگی پێ دەدەین، ئەمەش بۆخۆی حاڵەتێکی مەترسیدارە.

## پایەیەی سێیەم: پەروەردە

لێرەدا مەبەسـتی سـەرەکیمان لـە پـەروەردە، بریتییە لە: پسـپۆڕیی، واتە: گـەر پلانێکی بەهێزت هەبێـتو ئابوورییەکی باشیشـت هەبێت، پێویستت بەکەسانی پسـپۆڕو شارەزاو لێهاتوو هەیـە لەو بوارەی کە پلانەکەی بۆ داڕێژراوە؛ بۆ جێبەجێکردنی ئەو پلانە. بۆ نموونە پلانی سـەرژمێری، پێویستی بەکەسانێکە شارەزا بن لە ئامارda، نەك کەسانی دیکە، یان پلانی تەندرووستی، پێویستی بەشارەزای بواری تەندرووستی هەیە؟ واتە: گەر کەسانی پسپۆڕو شارەزا پلانەکە جێبەجێ نەکەن، ئەوا پلانەکە بەئەنجام نەگەیاندنی باشـترە.، بەڵام پسـپۆڕی بۆ هـەر بوارێك، لەڕێگای ئابووریی باشـەوە دەتوانرێت بەدەسـت بهێنرێت؟ چۆن؟ بەوەی بۆ نموونە پێویستمان بەکەسـێکە شارەزای کشتوکاڵ بێتو لێرە ئەو پسـپۆڕییەی ئەومان نییە، دەتوانین کەسێکی شایستە بەوەی کـە حـەزی لەو بوارە بێـت، بنێرینـە دەرەوەی وڵات؛ تاکو لەو بەشەدا بخوێنێت، کە ئێمە پێویستمانە، دوای وەرگرتنی بڕوانامە بگەڕێتـەوەو خزمەت لـەو بوارەدا بکات، بـەڵام ئەمەش بەپێی حەزو لێهاتوویی ئەو کەسە دەبێت، کە بۆ ئەو بوارە پێویستمانە بـەم شـێوازە بـەم سـێ پایـە گرنگـە، دەبینـە خاوەنـی حوکمڕانییەکـی زۆر بەهێـز، کـە دەتوانییـن کێبرکێـی وڵاتە پێشـکەوتووەکانی پێ بکەین. واتە: ئەم سێ پایەیە، یەکتری تەواو دەکـەن لەڕووی گرنگییەوە بەوەی هـەر پلانێك بۆ هەر بوارێك بێت داڕشـتنی بۆ بکەیت پێویسـتت بە ئابووریی باش‌و کەسانی شـارەزا هەیە بۆ بەجێگەیاندنی‌و یەك پایە لەم پایانە فەرامۆش بکەین، کار دەکاتە سەر کۆی سیستمەکەو پەکی دەخات.

بەپێی ڕیزبەندیش پلان گرنگترە لەوانی دیکە؛ چونکە چەند دارایی باش‌و کەسـانی شارەزات هەبێت، پلانت بۆ حوکمڕانی پێ نەبێـت، ناتوانیت حوکمڕانییەکی سـەرکەوتوو بـەرێ بکەیت؟! هەروەهـا داراییـش گرنگی خۆی هەیـە، بەڵام لـەدوای پلانەوە دێـت، بۆچی دوای پـلان؟ لەبەرئەوەی چەنـد داراییمان بەهێز بێـت، بێپلانـی ئەو داراییە دەکات بەکێشـە بۆ وڵات، بۆیە پلان یەکەمە، بەڵام بەبێ دارایی‌و ئابووریی باش، پلانیش مانای نییە؟ ئینجا پـەروەردە، کە هەموو ڕووەکانی پـەروەردە گرنگە، بەڵام لێرەدا مەبەستمان پێی لایەنی پسپۆڕییە بۆ جێبەجێکردنی هەر پلانێك، بەڵام گرنگی ئەم سێیەمە، هەرچەندە گرنگییەکی باشی هەیە، بەڵام بە دارایی باش، دەتوانین پسپۆڕیمان بۆ هەر بوارێك بوێت بەدەستی بهێنین.

## ڕوونکردنەوەیەکی گرنگ:

کـە دەڵێین پـەروەردە بەپێـی ڕیزبەندی، سـێیەمە لەڕوی حوکمڕانی‌و ئیدارەی وڵاتەوە، مەبەستیشمان پێی ڕووی پسپۆڕییە نەگەڕنا لەڕوی کۆمەڵایەتییەوە پەروەردە یەکەمە.

گەرسەیری حوکمڕانی ئێستای حکومەتی هەرێمی کوردستان بکەیـن دەبینین دوو لایەنی، کە پلان‌و پەروەردەن فەرامۆشـن؟ تەنهـا لایەنی ئابووریمان هەیە، کە هەمووی دەزانێت ئابووریمان باشـە، بەڵام نازانییـن ئابووریمـان پێکهاتووە لەچـی‌و داهاتمان چەندە، بۆیە بەڕاستی پێویستە لەڕێگای پلانی بەهێزەوە، دەست بە باشـکردنی سیستمی حوکمڕانی بکەین. کەواتە: گرنگیی پلان لەوەدایە، کە دەبێـت پلان بۆ دوو پایەکەی دیکەی حوکمڕانیش دابڕێژیـن، واتە: دەبێت چەندین پلانـی بەهێزمان هەبێت؛ بۆ

سێکتەرە گرنگەکانی ئابووریو بوژاندنەوەی سێکتەرەکانی ئابووری، هەروەها بۆ هەموو بەشەکانی پەروەردە، دەبێت جارێکی دی پلانی بەهێز دابڕێژین، واتە: پلان بۆ دوو بەشەکەی دیکەیشە بۆیە زۆر گرنگە. لەبەرئەمە ئێمە پایەی پلانمان هەڵبژاردووەو کاری تێدا دەکەین، کە بەپشتیوانی خودا چەندین پلانی بەهێز شی دەکەینەوە؛ بۆئەوەی ئێمەش بگەینە ئاستی وڵاتە پێشکەوتووەکان؛ لەبەرئەوەی هیچمان لەوان کەمتر نییە.

## بەشە سەرەکییەکانی پلان:




هەر پلانێك، بەشێوەیەکی سەرەکی پێکدێت لە چوار بەش:

یەکەم: دارشتن:

واتە: هەر پلانێك دەبێت بەشێوازێکی زۆرباش، دارشتنی بۆ بکەین، وەك ئەم ڕوانەی خوارەوە:

١. پێشەکی: (پێشەکییەك لەسەر پلانەکە).

٢. پێناسەی پلانەکە: (پێناسەیەکی گشتگیر).

٣. دەسپێك: (چەند خاڵێکی پلانەکە، وەك نموونەی بەهێز، باس بکرێت لەسەری).

٤. گرنگیی ئەم پلانە بۆ ئێستاو ئایندە: (ڕوونکردنەوە).

٥. چۆنێتیی جێبەجێکردن: (چەند ڕێگا هەیە بۆ جێبەجێکردنی ئەو پلانە).

٦. بەرنامەی بەکارهاتوو بۆ ئەو پلانە: (بەرنامەکە تەکنەلۆجی بێت، یان تەقلیدی).

٧. سوودەکانی پلانەکە: (بەخاڵ).

٨. زیانەکانی پلانەکە: (بەخاڵ).

٩. زانیاریو پێداویستی بۆ پلانەکە:

أ. ئەو پێداویستییانەی کە هاوڵاتی دەبێت دابینی بکات.

ب. ئەو پێداویستییانەی کە دەبێت لایەنی جێبەجێکار هەیبێت، بۆ کاتی جێبەجێکردن.

پ. پێداویستیی گشتی بۆ پلانەکە.

١٠. میکانیزمی جێبەجێکردن:

أ. ڕێگاکانی جێبەجێکردن، (چەند ڕێگا هەیە بۆ جێبەجێکردنی ئەو پلانە).

ب. هاوکاری، (هاوکاریی حکومەتو هاوڵاتی).

پ. کات، (چەند کاتت پێویستە بۆ جێبەجێکردنی ئەو پلانە).

ت. شێوازی کارکردن، (بە چ شێوازێك لە ٢٤ کاتژمێری ڕۆژانەدا، کار دەکەیت، واتە: چۆن ئەوکاتە دابەش دەکەیت بۆ کارکردن).

ج. فەرمانبەری پێویست، (چەند فەرمانبەرت پێویستە بۆ جێبەجێکردنی ئەو پلانە).

چ. بڕی بودجە، (چەند بودجەت پێویستە بۆ ئەنجامدانی ئەو پلانە).

ح. ڕاگەیاندن، (بەکارهێنانی هەموو جۆرەکانی ڕاگەیاندن بۆ سەرخستنی پلانەکە).

١١. بەرئەنجام: (واتە: مەبەستو ئامانجی ئەم پلانە بۆچی بوو).

بۆئەوەی پلانەکە بەهێز دەربچێت، دەبێت بەم شێوازە دارشتنی بۆ بکەین. دیارە هەموو پلانێك مەرج نییە بەم شێوازە بێت، بەڵکو بەپێی جۆری پلانەکە، ئەم خاڵانەش کەمو زیاد دەکات. بەڵام مەبەستمان لە بەهێزیی پلانە، بۆئەوەی پلانێکی بەهێزمان هەبێت، دەبێت بەم شێوازە دارشتنی بۆ بکەین. واتە: مەبەستمان پێی هەنگاوەکانی کارکردنو جێبەجێکردنی پلانەکەیە.

دووەم: شیکردنەوە:

واتە: شیکردنەوەی پلانەکە بۆ ڕای گشتی، لە ڕێگەی کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە، وەك (تەلەفزیۆن + ڕادیۆ + وێبسایتەکان + فەیسبووك + کتێب... هتد)، دەوڵەمەندکردنو ئامادەکردنی بۆ هەنگاوی دوای خۆی، کە جێبەجێکردنە.

هەنگاو بەهەنگاو، دەبێت ئەو پلانە شیکردنەوەی بۆ بکرێتو دەوڵەمەندکردنو بەهێزکردنی پلانەکەو ڕاو پێشنیاری هاوڵاتیش، دەچێتە قاڵبی شیکردنەوەوە.

سێیەم: جێبەجێکردن:

جێبەجێکردنی هەر پلانێك لەلایەن حکومەتەوە دەبێت، بەڵام کە دەڵێین حکومەت، نابێت بە مەزاجی خۆی بڕیار لەسەر کردن، یان نەکردنی پلانێك بدات، یان بیری خۆپەرستی تێدا بێت، بەڵکو دەبێت هەڵسەنگاندن بۆ هەموو لایەنەکانی پلانەکە بکات، گەر زۆر باش بوو، ئەنجام بدرێت.. گەر نا، دەبێت وەڵامی نەکردنی ئەو پلانە بداتەوە، کە بۆچی ئەو پلانە ناخرێتە بواری جێبەجێکردنەوە؟ لەبەرئەوەی حکومەت بڕیاربەدەستی یەکەمەو هەر پلانێکیش پێویستی بە بودجە هەیە بۆ جێبەجێکردن، بۆیە جێبەجێکردنی هەر پلانێك، دەکەوێتە ئەستۆی حکومەت.

شێوازی یاسایی جێبەجێکردنی هەر پلانێکیش، بەم جۆرەیە کە دوای دارشتنو شیکردنەوەی پلانەکە، پلانەکە ڕەوانەی وەزارەتی پلاندانان دەکرێت بۆ ئەوەی دیراسەی تەواوی بکاتو بڕیاری جێبەجێکردنی لەسەر بدات، کە بڕیاریان لەسەردا، ئەوکات چۆن لەم شیکردنەوەدا، ڕوونی دەکەینەوە پلانەکە جێبەجێ دەکەن، بەبێ کەموکوری. یان لەڕێگای سەرۆکایەتیی پەرلەمانی کوردستانەوە، خوێندنەوەی بۆ دەکرێت لەلایەن ئەندام پەرلەمانەکانەوەو دیراسەی دەکرێتو دەخرێتە دەنگدانەوە بۆ جێبەجێکردن. ئینجا لەڕێگای سەرۆکایەتیی حکومەتەوە، دەنێرێت بۆ وەزارەتی پلاندانان بۆ جێبەجێکردنو دەبێت پەرلەمانیش، چاودێریی جێبەجێکردنەکە بکات.

چوارەم: بەردەوامی:

دوای جێبەجێکردنی پلانەکە، دەبێت کادری بەتوانا بۆ ئەو پلانە دیاری بکرێت، بۆ بەردەوامی پێدانی ئەو پلانە. واتە: تەنها جێبەجێکردن مەرج نییە؟ بەڵکو گرنگیی هەر پلانێك لەسەر ئەم بەشە وەستاوە، کە بەردەوامی پێدانی پلانەکەیە بەو شێوازەی کە پێویستە.

لەڕێگای ئەم چوار بەشەوە دەتوانین بڵێین هەر پلانێك سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت، یان نا؟ دەبێت هەر پلانێك بەجوانی، ئەم چوار ڕێگا سەرەکییەی تێدا بەدی بهێنرێت، ئینجا دەتوانین بڵێین پلانێکی سەرکەوتوومان بەئەنجام گەیاندووە.



# ئاكاری فەرمانبەر

وەهاب حەسیب

### فەرمانبەر یان دامەزراو(موظف) کێیە؟

هاوڵاتـــی کاتێك لـــە دامەزراوەیەکی گشـــتییدا دادەمەزرێت، بارودۆخـــی جیـــاوازە لـــە هاوڵاتیەکی ئاســـایی، چونکـــە دەبێتە ســـەربازێكو کار بۆ ڕژێمی ڕامیاریی وڵاتەکەی دەکاتو قەرزداری ئەو دەوڵەتە دەبێت، پێویستە بە بیرو هۆشی، بڕوای بە ڕامیاریی دەوڵەتەکە هەبێت، بە جەستەو هۆش کار بۆ ئەو دەوڵەتە بکات، واتە: کارمەند موڵکی دەوڵەتەو موڵکی خۆیی نییە.

فەرمانبەر وەك کرێکاری کەرتی تایبەت خاوەن کرێی ڕۆژانەیە، حکوومەت لە بەرانبەر ئەو خزمەتگوزارییانەی پێشکەشی دەکات، کرێـــی ڕۆژانەی بۆ دیـــاری دەکات کە لە مووچـــەی مانگانەدا کۆ دەبێتەوە، هەروەها لە ژیانی سیاسیو بیرکردنەوەدا ئازادە.

بەشـــێوەیەکی گشـــتی، دەتوانیـــن بڵێین: لە هەمـــوو وڵاتانی پێشـــکەوتوودا، دامەزراو لە کەرتی گشتیدا، کۆمەڵە پسپۆڕییەکی یاساییە، فەرمانبەر بەکاری دەهێنێت بۆ بەرژەوەندیی گشتی، بە هیچ شێوەیەك وەك مافێکی تایبەت نادرێت بە فەرمانبەر؛ تا بە ئارەزووی خۆی بەکاریان بهێنێت.

لـــە (١٩٢١/٨/٢٣) یەکـــەم حکوومەتی عێراقـــی پێکهێنرا، ئەو کات گەورەترین کێشـــەی ئـــەو حکوومەتە، دانانی یاســـا بوو بۆ دامەزراندنو ڕێکخستنی فەرمانبەرانی عێراق، چونکە تا ئەوکات، پۆستە باڵاکانی وڵات لە ژێردەستی فەرمانبەرانی بیانیدا بوون.

ساڵی (١٩٢٩) لەو بوارەدا، یەکەم یاسا دەرچوو، ساڵی (١٩٣٦) بە یاســـای ژمارە (٦٩)، یاسای پێشـــوو هەڵوەشایەوە، ئەم یاسایە کاری پێ کرا، تا بە یاسای ژمارە (١٤) ی ساڵی (١٩٩١) هەڵوەشایەوە، دواتر لە ساڵی (٢٠٠٨) ئەم یاسایە هەموار کرایەوە.

### واتای ئاکار:

لـــە چەمکی شـــەرع (یاســـاکانی ئایینی ئیســـلام)دا زیاد لە واتایەك هەیە بۆ ئاکار:

ئاکار شـــێوەیەکی ڕەگاوەژۆیە لە ناخدا، کرداره خۆویســـتەکانی مرۆڤ لە باشو خراپ، جوانو ناشـــیرین لەو شـــێوەیەوە سەرچاوە دەگـــرن. چونکـــە شـــێوەکە ڕەگاوەژۆیـــە، بـــە ئاســـانیو دوور لـــە بیرکردنـــەوەو تێڕوانین، مرۆ دەتوانێت هەڵســـوکەوت بکات، ئەگەر کەسێك بەردەوام ئارەزوویەك بەسەریدا زاڵنەبوو، ئەوا خاوەن ئاکار نییە.

بـــە سرووشـــت ئـــاکار کاریگەر دەبێـــت بەو ژینگـــەی تێیدا گەشـــەدەکاتو پـــەروەردە دەکرێـــت، چونکـــە لە خـــۆڕا لەدایك نابێتو پێکڕا بە هێزو پێگەیشـــتوو نابێت، نهێنیی گەشەکردنو پێگەیشـــتنی لـــە زیـــاد دووبارەکردنەوەیدایە. وەك پـــەروەردگار دەفەرموێـــت: ﴿ وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴾ النازعات: ٤٠ - ٤١

ئـــاکار یەکێکـــە لەدەرهاویشـــتەکانی ڕۆشـــنبیریی گشـــتی،

هەرکۆمەڵگایـەك، هەروەهـا ئـاکار ڕێژەییـەو گشـتگیر نییە، لـە کۆمەڵگایەك بۆ یەکێکی دیکە، لە کەسـێك بـۆ یەکێکی دی دەگۆڕێت.

کاتێـك بمانەوێـت توێژینەوە لە ئـاکاری فەرمانبەر بکەین، پێویستە توێژینەوەکە لەسەر ئەو بنەمایانە بێت، کە کۆمەڵگاکە بـاوەڕی پێیانەو کاریان پێ دەکات، واتـە: کاتێك توێژنەوەی لە ئـاکاری فەرمانبەری بـاوەڕدار دەکەین، پێویسـتە کورتەیەك لە ئاکار لە ڕوانگەی ئیسلامەوە باس بکەین؛ چونکە ئایینی ئیسلام بینای کۆمەڵایەتی، ئابووریو... هتد، بەشێکی زۆری فەرمانبەرانی کۆمەڵگای کوردەواری پێك دەهێنێت.

بێگومان بەرپرسـیارێتی لە ئیسـلامدا، لە میانەی بیرۆکەی ئاوەدانکردنەوەی زەویدا گەڵاڵە دەبێت، تا دادگەریو یەکسانی لە نێـوان تاکەکانی کۆمەڵگادا بەرقەرار بێت ئاکارو بەرپرسـیارێتی پێکەوە پەیوەست کراون.

**گرنگترین بنەماکانی ئاکار لە ئیسلامدا:**

بنەماکانی باوەڕ: لە وانە باوەڕبوون بە خودا، بڕوابوون بەوەی کە پەروەردگار بەدیهێنەری مرۆڤەکانەو لە ڕێگای پەیامبەرانەوە ئادەمیزاد خۆی دەناسێتو باشو خراپ لێك جیادەکاتەوە. ڕۆژێك دادێت پرسـینەوەی لە تەکدا دەکرێـت، بێگومان پەیوەندییەکی پتەو لە نێوان باوەڕو ڕەفتارەکانی ئاکاردا هەن.

**بنەمای زانستی:**

ئاکار پارێزگاری لـە ژیانی تاك دەکاتو بەردەوامی پێدەدات، چونکە ئاکار لە تەك سرووشتدا، پێچەوانە نییە، بەڵکو تەواوکەرە، یاسـاکانی ئاکار وەك یاساکانی سرووشت جێگیرن، ئەوی ئاشکرایە لـە بەر ڕۆشـنایی ناسـینی سرووشـتی مرۆڤدا، ئایینی ئیسـلام چوارچێوەیەکـی دیاری کـردووە کە پێکهاتەیی مـرۆ بریتییە لە لاشـەو ڕۆح، دابینکـردنو هاوسـەنگراگرتنی پێداویسـتییەکانی ئـەو دوو لایەنە پێویسـتە، تا ئادەمیزاد بتوانێت ئەرکەکانی بە جوانترین شـێوە تەواو بکاتو بە تەنهـا نەبێت بە کۆیلەی مادە، یان ڕۆح.

**پەیوەستبوون:**

پابەندبوون یەکێکە لە گرنگترین بنەماکان، کە سیسـتەمی ئـاکاری لەسـەر بنیات دەنرێـت، بەو پێیەیی لـەم ژیانەدا مرۆ داوالێکـراوە، ئەمانـەتو پەیامێکـی لـە ئەسـتۆدایە، هـاوکات ویسـتێکی ئـازادی هەیە، کە باڵادەسـتە بەسـەر کردەوەکانیدا، بۆیە پەیوەسـتبوون بە ئاکارە جوانەکانەوە، دیارترین مەشخەڵی بەرپرسیارێتییە لە ئیسلامدا، واتە: پێویستە فەرمانبەر بەرانبەر ئـەو مووچەی وەری دەگرێت، خۆی مانـدوو بکات، وەك دەڵێن: نانەکە حەڵاڵ بکات.

فەرمانبـەران لە ڕێکخراوە یابانییەکانـدا، هێندە پابەندن بە پێشکەوتنو پاراستنی بەرژەوەندیی وڵاتەکەیانەوە، ڕێژەی نەهاتن (غیـاب) کـە ڕێکخراوەکانـی ئەو وڵاتـەدا لـە (٢٪) کەمترە، کە کەمترین ڕێژەیــە لە جیهاندا، تەنانەت دەوترێت لە کاتی دەوامی فەرمیـدا قاوەخانەو شـوێنە گشـتییەکان بەشـێوەك چۆڵ دەبن جێگای پرسیارن لای کەسانی نەشارەزا. پێویستە فەرمانبەر خاوەن ئاکارێکی چاك بێتو هەسـت بە بەرپرسیارێتی بکات، مەبەست لە بەرپرسـیارێتی ئەوەیـە، کە مرۆڤ خۆی بە بەرپرسـیار بزانێت، بەرانبـەر بـە کردەوەکانی لە بەرانبـەر خوداو پاشـان ویژدانو کۆمەڵگاکەیدا.

**سەرچاوەکانی ئاکار:**

١. **خود:** خود یەکەم سەرچاوەی ئاکارە، مرۆ هەوڵی بەدیهێنانی کارێك نادات، ئەگەر لە ناخییدا ڕەنگدانەوەی نەبێت، واتە: کارێك سـەرچاوەکەی بنەماکانی ئاکاربێت، بێگومان کارێکە لە بەردیدی خاوەنەکەیو مرۆڤایەتییدا جوانو سەرنجڕاکێشە، ئەم تێڕوانینە، کار دەکات بۆ دەستەمۆکردنو بەرزڕاگرتنی یاساکانی ئاکار.

٢. **خێـزان:** ئادەمیـزاد لـە خێزانەکەیـەوە، ڕەفتـاری بۆی دەمێنێتـەوەو دەیگوێزێتەوە بـۆ ڕێکخراوەکان، ئـەم ڕەفتارانە، ڕەنگدانەوەی ژینگەو شـێوازی ژیانـی مرۆڤەکانە، ئەو خێزانەی کە نەوەکانی لەسـەر ڕاسـتگۆیی، ڕێزگرتنو دەستپاکی پەروەردە دەکات، ئەوانیـش لـە ژینگەی کارو مامەڵەیانـدا، ئەو بنەمایانە لەگەڵ کەسانی دیکەدا جێبەجێ دەکەن.

٣. **دامەزراوەکانـی فێرکردن:** ئەم ڕێکخراوانە دەتوانن ڕۆڵێکی گرنگ ببینن لە دامەزراندنی خوێندکاران لە بواری کارکردندا، لەو ڕێگایەوە، دەتوانن لە هەندێك بوارەکانی ئایین، ئاکارو پەیوەندیی گشتییدا، فێرخوازان هۆشیار بکەنەوەو ئاڕاستەیان بکەن.

٤. **کۆمەڵـگا:** ئـەو کۆمەڵگایـەی کۆمەڵێك بەهـای ڕامیاری، کۆمەڵایەتـیو بیروبـاوەڕی گونجاوی تێدا باڵادەسـتە، بێگومان تاکەکانی کۆمەڵگا، ئەو بەهایانە دەگوێزنەوە ناو ئەو ڕێکخراوانەی کاری تێـدا دەکەن، بـە تایبەت ئەگەر بنەماکانی ئاکار، لەسـەر ترسان لە خوداو پرسینەوەی ڕۆژی دوایی بێت.

٥. **سـەرکردەیەکی پێشـڕەو:** سـەرکردەی سـەرکەوتوو، ئەو ڕابەرەیـە کـە دەتوانێت لە پەیکەرێکی بێگیانـدا، ڕوح بکات بە بـەری ژیاندا، بەوەی هـەر دامەزراوێك لـە بەڕێوەبەرێتییدا لە ڕێگای هاوکاریو کاری هەرەوەزەوە دەتوانێت ئامانجێکی دیاریکراو بـەدی بهێنێت، بەو بۆچوونەش جوانییەکانی ئاکار، لە دەروونی بەردەسـتەکانیدا دەڕوێنێتو ڕێزی بەرانبەر دەگرن، ئەوکارانەش لە بەرژەوەندیی گشتییدایە.

٦. **ڕێسـاکانی ڕاژەی شارسـتانی:** لە پاڵ ڕێساکانی کۆمەڵگادا، ڕێسـاکانی ڕاژەی شارسـتانی بـە سـەرچاوەیەکی گرنگـی ئاکار دادەنرێـن؛ چونکـە کاریگـەری هەیە لەسـەر شـێوازەکانی کار بەڕێکردنو خزمەت بـە ئامانجەکانی دەوڵەت دەکات، واتە: کارو بەرپرسـیارێتییەکان دیـاری دەکات؛ چونکە لـە بەڕێوەبردندا، بنەمایەکـی سـەرەکین. ئەو قەیرانـە کارگێڕیەی لـە ئەمڕۆدا، هەرێمی کوردسـتان گرفتـاری بووە، بەشـێکی زۆری پەیوەندی بـە لاوازبوونی ئاکارو هەسـتنەکردن بە بەرپرسـیارێتییەوەیە، لە بەرانبەر خوداو پاشـان ویژدانو کۆمەڵگاو مێژوودا، باشترین چارەسـەریش، بوژاندنەوەو گەشـەکردنە بە بنەمـا جوانەکانی ئاکار. تا بکرێن بە سوپەرو قەڵغانێك، دژ بە گەندەڵیو بەرانبەر بە سوپاکەی بەکار بهێنرێن.




# سەلیقەی کارگێڕی

ن: دایان ترەیسی

## ئاخۆ بەڕێوەبەر، دەبێت چ کارێك بکات؟!

لــەم بەیانییــەدا، خەونەکەت بووە بە ڕاســتی، پلەکەت بــەرز کراوەتەوە، ئێســتە ناوەکــەت، لەگــەڵ نازناوەکانی؛ سەرۆکبەش، یان سەرتیپ، یان سەرپەرشت، یان بەڕێوەبەری جێبەجێکردن، یان بەڕێوەبەری گشتیدا دەهێنرێت.

بەڵێ، بوویت بە بەڕێوەبەرێك کە:

وات لێهاتووە، لەچاو کارمەندەکانتدا، مووچەیەکی زۆرتر وەربگریت، گەرچی هێشــتا لەو مووچەیەی دڵخوازی خۆتە کەمترەو کوڵی دڵت دانامرکێنێت.

وات لێهاتووە، لە نووســینگەیەکی گەورەترو لە ژوورێکی بەرفروانتردا دابنیشیت، هەروەك بڵێیت، ئەو شتانەی لێیان بەرپرسیت، چەند قات چوونەتە سەر.

## ئــەو شــتانەی نابێتەوە بە خاوەنیــانو لە ڕکێفت دەرچوون:

سەربەســتبوون لەوەی بەس خەمی خۆت بێت؛ (بەڵکو دەبێــت خەمی کارو کارمەندەکانیشت بخەیتە ســەر باری خەمی خۆت).

٢. شــاباشو پاداشت وەرگرتن لەسەر کاری زیادە؛ (واتە: چاوەڕێی پاداشــتی کارکردنت، لە دوای دەوام مەبە؛ چونکە ئێستە، خۆت خاوەنکاریت، نەك کارمەند).

٣. مافی ئەوەت هەبێت، کە شەوانە دەگەڕێیتەوە ناو ماڵو منداڵــت، کارەکــەت لەبیر بەریتەوەو خەمــی لێ نەخۆیت. (واتە: تازە وەکو ئەو کارمەندە ئاساییە نەماویت، کاتێك لە شوێنی کارەکەی دەچێتە دەر، بیر لە کارەکەی ناکاتەوەو بە دوای ژیانو خۆشیی خۆیدا دەچێت)

## بۆچی بەڕێوەبەرەکان، مووچەی زۆرتر وەردەگرن؟!

ئــەرێ دەبێــت بەڕێوەبەر چی بــکات، وا ئــەم هەموو بەستەوسەفتە پارەیەی دەست دەکەوێت؟!

وەڵامەکەی ئاسانە:

- بەلۆعەچی، بۆریو بەلۆعە چاك دەکاتەوە.
- دارتاش، کورسی درووست دەکات.
- وەستا، دیوار هەڵدەچنێت.
- فرۆشیار، شمەك دەفرۆشێت.
- ژمێریار، ژمێرەی پارەو کاڵا دەکات.
- هەرچی بەڕێوەبەریشە، خەڵکی بەڕێوە دەبات.

هەر بەڕاســتی بەڕێوەبردنــی خەڵکی، لە چاککردنەوەی بۆریو بەلۆعە، لە کورسی درووستکردن، لە دیوار هەڵچنین، لە فرۆشــتن، لە کۆکردنەوەو لێکدانو لێدەرکردن، سەختو دژوارترە؛ چونکە بەدڵنیاییەوە، خەڵکی لە شــمەکەکان، زۆر ئاڵۆزترنو پێچوپەناشیان زۆرترە!

# گەشەپێدانی ئابووری

ن: د. عبدالكريم بكار
و: حسێن نەجمەدین قەرەداغی

**بەشی یەکەم**

کەس نکۆڵی لەوە ناکات، کە دارایی (پارە)، تەوەری بنچینەییە لە ژیانی هاوچەرخدا، گرفتی مامەڵەش لەگەڵ ئەم تەوەرەدا ئەوەیە، کە داوەریی هەموو لایەنەکان دەکاتو لەسەرت پێویست دەکات، کە لە هەموو ئەو گۆڕانکارییانەی دەتەوێت بەدیان بهێنیت لە بوارو بازنە جیاوازەکاندا، بۆی بگەڕێیتەوە.

ئەگەر بڕیارماندا –بۆ نموونە- بۆ کەمکردنەوەی کاریگەریی شۆڕشی داراییو پارە لە ژیانی کۆمەڵایەتیماندا، پێویستە کار بکەین بۆ بەرزکردنەوەی هەندێ بەهاو نموونەی کرداری، وەك خۆگرتنەوە لە دونیاو بەرەو قیامەت چوون، هەوڵدان بۆ وەرگرتنی چێژ لە بیرو هزرو پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکان.

بۆئەوەی بتوانین گۆڕانکاری لە ڕیزبەندیی بەهای مرۆڤەکاندا بکەین، ئەوا پێویستمان بە پارەو دراییە بۆ بەرنامەو دامەزراوەو دەستە کارگێڕییەکان، کە بەو کارە گەورەیە هەڵدەستن، واتە: پێویستە ڕادەیەکی زۆرتر پارەمان بەردەست بێت؛ تا بتوانین خواستی خەڵك بۆ پارە کەم بکەینەوە!!

هەروەکو وتراوە: پارە سکاڵالێکراوە (نەیار)و دادوەریشە لە هەمان کاتدا.

باری دارایی زۆربەی وڵاتانی موسوڵمانانشین باش نییە، ڕێژەیەکی زۆر لە زیادبوونی دانیشتووانو لە بەرامبەریشدا گەشەپێدانی باش نابینین، هەروەها ڕێژەیەکی زۆر لە بێکاری دەبینین، لەو لاشەوە زۆرن ئەوانەی کە ڕوو لەو کارو پیشانە دەکەن، کە داهاتێکی وا دەستەبەر ناکات، کە گونجاو بێت لەگەڵ لایەنی کەمی ژیانی شکۆمەندیدا، هەموو ئەمانە لە کاتێکدایە، کە تێچووی ژیان لە بەرزبوونەوەدایە، بە زیادبوونی تێچووی تەندرووستیو فێرکردنو ڕاهێنان.

لەبواری پیشەسازیدا زۆربەی وڵاتانی موسوڵمانانشین وەك زۆر لە ئاماژەکان نیشانی دەدات لە ساڵی ١٩٧٠دا هاوشێوەی ژیانی پیشەسازیی بەریتانیا بووە لە (١٨٠٠) داو وەك فەرەنسا بووەو لە ساڵی (١٨٨٤) واتە: بە جیاوازی نزیکەی دوو سەدە لە دوای ئەو وڵاتانەوەیە.

هەروەها هەندێ لە لێکۆڵینەوەکان، ئەوە نیشان دەدەن، کە بەرکەوتی تاك لە داهاتی نەتەوەییدا لە گەلانی (جیهانی چوارەم) تا ئێستا کەمترە لە هاوتاکەی لە ئەمریکاو بەریتانیا لە ساڵی (١٧٧٦)دا.

### باری دارایی جیهانی هاوچەرخ:

قەیرانی دارایی لە ڕابوردوودا بەهۆی کەمی خستنەڕووەوە، ناتەواوی بەرهەم ڕووی دەدا.

بەڵام ئەمڕۆ گرفتی سەرەکی، لە کەمیی داواکاری خستنەڕوودایە، سەرەتای قەیرانی دارایی نوێ، دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای حەفتاکانو تا ئەمڕۆش بەردەوامەو ئەم تایبەتمەندییانەی هەیە:

١- پێچەوانەی ئەو قەیرانە داراییانەی کە پاش جەنگە جیهانییەکان ڕوویان داوە، ئەم قەیرانە بەوە جیا دەکرێتەوە، کە گشتگیرەو لە زۆربەی وڵاتە سەرمایەدارییەکاندا هەیە، ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی کە گرفتەکە ئاڵۆزتر بکاتو دەرچوون لێی نارەحەت بێت، هەروەها بووە بە هۆی لاوازیی گرنگیی کەناڵی بازرگانیی دەرەکیو هاوسەنگیی نێوان وڵاتانی سەرمایەداری.

٢- لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو قەیرانەدا، میکانیزمی نرخدانان گرنگی خۆی لەدەست دا، ئەو میکانیزمە یارمەتیدەر بوو؛ بۆ بەرەنگاربوونەوەی لاسەنگیی نێوان بەرهەمو بازاڕ.

٣- قەیرانی قەرزی دەرەکی لەسەر کۆمەڵێك لە وڵاتانی دواکەوتوو، گەشتۆتە ئاستێکی ترسناك، لە ساڵی (١٩٧١)دا قەرزی وڵاتە هەژارەکان، لە سنووری ٨٦ ملیار دۆلاردا بوو، بەڵام لەساڵی(١٩٨٤) دا بەرزبووەتەوە بۆ ٨١٤ ملیاردۆلار بەجۆرێك زۆر لەو وڵاتانە لەتوانایاندا نییە، زیادە(سوو)ی ئەو قەرزانە بدەن، لەکاتێکدا ئەم وڵاتانە لە ڕابوردوودا بەشێوەیەکی خێرا گەشەیان دەکرد، توانای دانەوەی بەشێك لە قەرزەکانیانو بەکارهێنانی وەبەرهێنانی نوێیان هەبوو، بەڵام ئەم بارودۆخە نوێیە، بووە هۆی بێبەشکردنی سەرمایەداری بۆ ڕزگاربوون لەو قەیرانە ئابوورییە.

٤- تاڵانکردنی بەردەوام، بەشێوەی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ، ئەمەش بووە هۆی داچۆڕینی توانای ئابووریی وڵاتە هەژارەکان، هەندێ لە ئابووریناسان، ئەو بڕەی لە ساڵەکانی پەنجاکانو شەستەکاندا، لەلایەن وڵاتە سەرمایەدارەکانەوە بەتاڵان براوە، بە ٢٠٠ ملیار دۆلاری ساڵانە دەخەمڵێنن، لەو لاشەوە زۆر هەوڵو تێکۆشانی بوژاندنەوە لەو وڵاتانەدا، گەیشتوەتە ڕێگایەکی داخراو.





# ماسییەکی نەفام!

نووسینی: زکریا تامر
و: محەممەد مێرگەیی

ئەو ڕۆژە هیچ ڕاوچییەك نەهاتبووە سەر چەمەكە، بۆیە ماسییەكان بەئاسوودەیی لە نێو ئاوی ژێر تیشكی درەوشاوی خۆردا، مەلەیان دەكرد.

ماسییەكی چكۆلە، لە ماسییەكی مەزن نزیكبوویەوەو پێی گوت: من ناتوانم لەوە تێبگەم، بۆچی ماسییەكان ڕقیان لە ڕاوچییەكان دەبێتەوەو لێیان دەترسن!؟

ماسییە مەزنەكەش، بەسەرسورمانەوە بە ماسییە بچكۆلەكەی گوت: هیچ یەكێك لە ماسییەكان ئەو قسەیە ناكات، تەنها ئەوە نەبێت كە ڕقی لە ڕاوچییەكان نابێتەوەو لێیان ناترسێت.

ماسییە بچكۆلەكە گوتی: ئینجا بۆچی ڕقم لە ڕاوچییەكان ببێتەوەو لێیان بترسم؟ جارێكیان كەوتمە ناو تۆڕەكەیان، ئەوان بەنەرمیو خۆشەویستییەوە تەماشایەكی منیان كردو خستمیانەوە نێو ئاوەوە.

ماسییە گەورەكە گوتی: ڕۆڵە لەبەر دوو چاوی ڕەشت تۆیان نەگەڕاندووەتەوە ناو ئاوەكەوە، بەڵكو لەبەرئەوەیە هێشتا بچووكیو هێندە گۆشتن نیت، دەیانەوێت مەزنبیتو قەڵەوبیت، ئینجا ڕاوت بكەن.

ماسییە بچكۆلەكەش گوتی: كە گەورە بووم، بە هەموو توانای خۆم هەوڵ دەدەم بانگەوازی نەهێشتنی ڕقوكینەی نێوان ماسیو ڕاوچییان بكەم!

ماسی گەورە دەستی كرد بە ئامۆژگاریی ماسی بچكۆلەو پێی گوت: ئاگاداری ئەوە بە؛ كاتێك گەورە دەبیت، ڕاوچییەكان ڕاوت دەكەن، ئینجا دەتفرۆشنە چێشتخانەكانو ناوت لە لیستی ڕۆژانەی خواردنەكان تۆمار دەكەن.

كە ماسییە چكۆلە گوێی لەم قسانەی ماسییە مەزنەكە بوو، بە ستەمكردن لە ڕاوچییان خەتاباری كرد! ماسی مەزن پێی گوت: گەلەك جیاوازیی هەیە لەنێوان ئەوانەی ماسییان خۆش دەوێتو ئەوانەی حەز لە خواردنی دەكەن، لەوە دەترسم هەتا كار لە كار نەترازێت، تۆ لەو جیاوازییانە تێنەگەیتو ئاگادارنەبیتەوە.

ماسییە چكۆلەكە بەم قسانەش هەر لەسەر بیروڕای خۆی مایەوەو بە پەرۆشەوە بەرگری لە ڕاوچییەكان دەكرد، بۆیەش ماسییە گەورەكە، بەتووڕەییەوە لێی دوور كەوتەوە.. بەڵێ، لە ماسییەكی گەمژەو نەفام دووركەوتەوە، كەوا ڕاوچیو گۆشتخۆرانی خۆی خۆش دەوێت!







# ناسکبوونەوەی ئێسك

## Osteoporosis

ن: د. حسان شمسی پاشا --- و: یەحیا محەممەد عەلی

### ١. ناساندنی نەخۆشییەکە:

نەخۆشییەکە تووشی زیاد لە (٢٠٠ ملیۆن) ئافرەت دەبێت لەشوێنە جیاجیاکانی جیهانداو دەبێتە هۆی شکانی ئێسك لە (١.٥ ملیۆن) پیاوو ئافرەتدا.

ناسکبوونەوەی ئێسك واتە، ئێسك کانزا پێویستەکانی لەدەست داوە، ئەمەش وا دەکات ئێسکەکە بە ئاسانیی بشکێت. ئەم نەخۆشییە زۆرتر لە ئافرەتاندا باوە، تا لە پیاوان، بەجۆرێك ئافرەتانی سەرو چل ساڵ، یان سی ساڵ دەگرێتەوەو هەندێك جار لە تەمەنێکی زووتریشدا. لە سێ ئافرەت یەکێکیان دەناڵێنن بەدەست ئەم نەخۆشییەوە، بەڵام لە دوانزە پیاو، یەکێکیان هەمان کێشەیان هەیە.

ئەوەی جێی مەترسییە ئەوەیە، کەسەکە زۆر ئاسانتر ئێسکەکانی دەشکێت، کە ڕەنگە لە شوێنە هەستیارەکانی وەك بڕبڕەی پشت، ئەژنۆو قولەپێدا ڕوو بدات. بەداخەوە ملیۆنان کەس نازانن ناسکبوونەوەی ئێسکیان هەیە، تا تووشی شکاوییەکی لەناکاو دەبن، ئەوجا پزیشك دەیاننێرێت بۆ پێوانی چڕی ئێسك.

پەروەرگار لەقورئاندا، لەسەر زمانی زەکەریا پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لێبێت)، بۆمان دەگێڕێتەوە؛ پاش ئەوەی تەمەنی چووەسەرو ئێسکەکانی لاوازبوون، لەخودای خۆی نائومێد نەبووەو داوای کردووە منداڵێکی ژیکەڵەی پێببەخشێت: ﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ ٱلۡعَظۡمُ مِنِّي وَٱشۡتَعَلَ ٱلرَّأۡسُ شَيۡبٗا وَلَمۡ أَكُنۢ بِدُعَآئِكَ رَبِّ شَقِيّٗا ﴾ مریم: ٤، دەستەواژەی (وَهَنَ ٱلۡعَظۡمُ) گوزارشت لە لاوازیی ئێسك دەکات لە ئەنجامی هەڵکشانی تەمەنەوە.

ئێسکەکانمان لەسەرەتای تەمەنەوە وردەوردە دەست دەکات بە بەهێزبوونو چڕیی ئێسکمان، لە تەمەنی (٢٥) ساڵیدا، دەگاتە بەرزترین ئاست. پاش ئەوە، وردە وردە بەرەو دابەزینو لاوازبوون دەچن لەگەڵ تێپەڕبوونی تەمەندا.

پێوانی چڕیی ئێسك(**bone densitometry**)، لەڕێی جۆرێکی تایبەت لە تیشکی ئێکسەوە دەبێت.

### ٢.هۆکارەکانی ناسکبوونەوەی ئێسك:

#### أ. کەمیی دروستکردنی ئیسترۆجین:

ئافرەتان لەدوای تەمەنی بێئومێدییەوە؛ (نەمانی سووڕی مانگانە)، زۆر زیادتر تووشی دەبن.

#### ب. ئەو هۆکارانەی پەیوەستن بە نەخۆشەکەوە:

چوونەسەری تەمەن.

ڕەگەزی مێینە.

وەستانی سووڕی مانگانە پێش کاتی خۆی، (چلو پێنج ساڵی).

دووگیانبوون زیاد لە سێ جار بەدوای یەکدا(ماوەی نێوانیان کەمبێت).

کەسانی جەستە لاواز.

#### ج. ئەو هۆکارانەی پەیوەندی بە شێوازی ژیانەوە هەیە:

کەم خواردنی کالسیۆم.

ئەنجامنەدانی وەرزش.

کەم خۆدانە بەر خۆر.

#### د. نەخۆشییەکانو بەکارهێنانی دەرمانەکان:

نەخۆشییەکانی کۆئەندامی هەرسو لاوازیی مژینی ماددە خۆراکییە بەسوودەکان.

گورچیلەسستی.

بەکارهێنانی ئاوێتەکانی کۆرتیزۆن (ستیرۆیدەکان).

دەرمانی دژەفێ (پەرکەم).

دەرمانی دژەخوێنمەیین (**Antiplatelet**)ی وەك هیپارین(**heparin**).

### ٣.خۆپاراستن:

وەرزش بەتایبەت ڕۆیشتن.

خۆدانە بەر تیشکی خۆر.

دوورکەوتنەوە لە جگەرەکێشان.

چاودێریکردنی بەردەوامی تەندرووستی.

پشکنینیی هۆرمۆنییو کوێرەڕژێنەکان لای ئافرەتان.

زۆر خواردنی ئەو خۆراکانەی دەوڵەمەندن بە کالسیۆم، وەکو: شیرەمەنییەکان، گۆشتو ڕۆنی ماسی، هێلکە، گێزەر، پرتەقاڵ، مۆز، سپێناخ، سەوزەو میوەکان. کالسیۆم ماددەیەکی گرنگەو لەشت زۆر پێویستی پێیەتی، بەڵام بڕی پێویستیی لەکەسێك دەگۆڕێت بۆ کەسێکی دی، ئەو کەسانەی زۆر پێویستیان بە کالسیۆمە (منداڵ، هەرزەکار، ئەو ئافرەتانەی شیر دەدەنە منداڵەکانیانو ئافرەتانی دوای تەمەنی بێئومێدیی).

وەرگرتنی ڤیتامین **D**: کە گرنگترین سەرچاوەی بریتییە لە خۆدانە بەر تیشکی خۆر، ئەگەر زۆر خۆرت لێنادات، ئەوا تووشی کەمیی دەبیت لە ڤیتامین **D**و پێویستە سەردانی پزیشك بکەیت!

# نەخۆشیی شێرپەنجەو چارەسەرکردنی

هەرمێ عەبدوڵڵا

نەخۆشیی شێرپەنجە، هەموو کەسێك دەگرێتەوە، وەك پیرو گەنـجو پیـاو ژنو منداڵو دەوڵەمەندو هەژار. ئەم نەخۆشـییە، بارێکی زۆر دەخاتە سـەر نەخۆشو خێزانو کۆمەڵگا. شێرپەنجە هۆکارێکـی کاریگەریی مردنـە لە جیهاندا، بەتایبـەت لە وڵاتە هەژارەکاندا.

دەتوانرێت رێگری بکرێت لە هەندێك لەم مردنانە. زیاتر لە ٣٠./. شـێرپەنجە، دەتوانرێت چارەسـەر بکرێت بە هۆی شێوازی ژیانی تەندرووست، یان بە هۆی بەرگری دژی هۆکاری تووشبوون بە ڤایرۆسـی (HBV، HPV)، ئەوانـی دی دەتوانرێت بەزوویی دەستنیشـان بکرێنو چارەسەر بکرێن. هەتا ئەگەر لە قۆناغێکی درەنگیشدا بن، دەتوانرێت ئازارو ناڕەحەتیی نەخۆش نەهێڵرێت، بەهۆی چاودێریو وەرگرتنی چارەسەری پێویستەوە.

**١٠ زانیاریی گرنگ لەبارەی شێرپەنجەوە بزانە:**

١- زیاتر لە ١٠٠ جۆر شـێرپەنجە هەیە، ئەگەری هەیە هەر بەشێکی لەش تووش ببێت.

٢- لە ٢٠٠٨ دا ٧،٦ ملیۆن کەس بەهۆی شێرپەنجەوە مردوون، کە دەکاتە لە ١٣./.ی هەموو مردن لەسەرتاسەری جیهاندا.

٣- نزیکەی لە ٧٠ ٪ی مردن، بەهۆی شـێرپەنجەوە، لە وڵاتە هەژارو مامناوەندەکاندا ڕوو دەدات.

٤- ناسـراوترین پێنـج جۆری شـێرپەنجە لـە جیهاندا، کە دەبێتـە هۆی مردنی پیاوان ئەمانەن (شـێرپەنجەی سـییەکان، شـێرپەنجەی گەدە، شـێرپەنجەی جگەر، شـێرپەنجەی کۆڵۆن، شێرپەنجەی سوورێنچك).

٥- ناسـراوترین پێنج جۆری شـێرپەنجە لـە جیهاندا، کە دەبێتـە هۆی مردنـی ئافرەتان ئەمانەن: (شـێرپەنجەی مەمك، شێرپەنجەی سییەکان، شـێرپەنجەی گەدە، شێرپەنجەی کۆڵۆن، شـێرپەنجەی درکەپەتـك)، لـە هەندێ لـە وڵاتـە هەژارەکاندا (شێرپەنجەی درکەپەتك) باوترین جۆری شێرپەنجەیە.

٦- بەکارهێنانـی توتـن (جگـەرە)، یەکێکە لـە گەورەترین هۆکاری بڵاوبوونەوەی شێرپەنجە لە جیهاندا، کە دەبێتە هۆی لە ٢٢./. مردن بە شێرپەنجە.

٧- لە هەر پێنجیەکی نەخۆشـییەکی شێرپەنجە لە جیهاندا، بەهۆی هەوکرنی درێژ خایەنەوەیە. بۆ نموونە: (ڤایرۆسی یومان پاپیلۆما) HPV دەبێتە هۆی شێرپەنجەی درکەپەتكو (ڤایرۆسی هیپاتیتیس بی) دەبێتە هۆی شێرپەنجەی جگەر.

٨- (HBV) لـە جـۆرە ناسـراوەکانی شـێرپەنجەیە، وەك (شـێرپەنجەی مەمكو درکە پەتكو کۆڵۆن) دەتوانرێت چارەسەر بکرێت، ئەگەر زوو دەستنیشـان بکرێتو چارەسەری پێویستی بۆ بەکار بهێنرێت.

٩- ئەگەر زانیاریی تەواو لەسـەر نەخۆشـییەکەو هۆشیاریی تەندرووسـتی هەبێـت، دەتوانرێـت ئـازارو ناڕەحەتیی هەموو نەخۆشێك کەم بکرێتەوە.

١٠- زیاتر لە ٣٠./. شـێرپەنجە، دەتوانرێت ڕێگری لێبکرێت بەهـۆی جگەرەنەکێشانو ژەمـی (خۆراکـی) تەندرووسـتو وەرزشکردنو دوورکەوتنەوە لە خواردنەوە کهوولییەکان.

لە هەندێك وڵاتدا، توانراوە لە ٢٠./. ی مردن بە شـێرپەنجە ڕێگـری لێبکرێت، بەهۆی بەکارهێنانی بەرگری دژی تووشـبوون بە (HBVو HPV).



# لێکدانەوەی کەسایەتیت، بەپێی مانگی لەدایکبوونت.. مانگی حەوت

سیفاتە ئەرێنییەکانی کەسانێك، کە لە مانگی حەوتدا لەدایکبوون:

١- مرۆڤێکی چێژوەرگرە، یاخود چێژبەخشە.
٢- کەسانێکی نهێنیپارێزن.
٣- کەسانێکی هێمنو لەسەرخۆن، تەنها کاتێك نەبێت، کە هەست بە تووڕەکردن، یان سەرخستنە سەر بکەن.
٤- شانازی بە خۆیانەوە دەکەن.
٥- خاوەنی ناوبانگێکی باشن، پاکو بێگەردن.
٦- بە ئاسانی دڵنەواییان دەکرێتەوە.
٧- کەسانێکی باوەڕپێکراون.
٨- گرنگی بە هەستو سۆزی کەسانی بەرامبەر دەدەن.
٩- مرۆڤگەلێکی میهرەبانو بەسۆزن.
١٠- خۆشەویستو لەبەردڵانن.
١١- قسەکردن لەگەڵیاندا ئاسانە.
١٢- لەسەر شێوەی سرووشتیی خۆیان، هەڵسوکەوت دەکەن، لەگەڵ ئەوەشدا پێشبینیکردنی هەڵسوکەوتیان زۆر قورسە.
١٣- کەسانێکی شۆخو ڕێکوپێکو سوعبەتچیو قسەخۆشن.
١٤- حەزیان بە تۆڵەکردنەوە نییە.
١٥- حەزیان بە شتی نامەنتیقیو ناپێویست نییە.
١٦- ڕابەرایەتیی کەسانی دەوروبەریان دەکەن، لە ڕووی ماددیو مەعنەییەوە.
١٧- بە یەکسانی مامەڵە لەگەڵ دەوروبەردا دەکەن.
١٨- خاوەنی هەستێکی سۆزداری بەهێزن.
١٩- کەسانێکی زیرەکو وریان.
٢٠- کەسانێکی تێکۆشەرو ماندوونەناسن لە کاردا.
٢١- دروشمیان بریتییە لە: هیچ شتێك قورس نییە.

سیفەتە نەرێنییەکانی ئەو کەسانەی لە مانگی حەوتدا لەدایکبوون:

١- بەپێی ڕواڵەتیان خەڵکی هەڵدەسەنگێنن، حوکمیان دەکەن.
٢- کەسانێکی ئاڵۆزنو زۆر بە گران دەتوانیت لێیان تێبگەیت.
٣- زۆر عاتفیو دڵناسکن.
٤- کەسانێکی مەزاجیو هەستیارن.
٥- لێبوردەن، بەڵام هەرگیز لە بیری ناکەن.
٦- بڕوا بەخۆبوونیان کەمێك لاوازە.

کەواتە سیفەتی ئەرێنیان نزیکەی چوار هێندەی سیفەتە نەرێنییەکانە، دەتوانن بە ڕاهێنانو بەخۆداچوونەوە، ڕێژەکە لەوەش کەمتر بکەنەوە.

* لەبەرئەوەی مانگی حەوت هاوکاتە لەگەڵ وەرزی هاویندا، بەشێوەیەکی گشتی، باس لەو منداڵانەش دەکەین، کە لە وەرزی هاویندا لەدایکبوون:

توێژینەوەیەکی نوێی بەریتانی ئەوەی سەلماندووە، کە ئەو کەسانەی لە وەرزی هاویندا لەدایك دەبن، لە وانەی بیرکاریدا بە ١٣ مانگ لە دوای هاوڕێکانیانەوەن، لەبەرئەوە تووێژەران جەختیان لەوە کردۆتەوە، کە ئەو منداڵانەی لە مانگی حەوتو هەشتدا هاتوونەتە دونیاوە، زیاتر پێویستیان بەوەیە کە کاتژمێری ئیزافی وانەی بیرکاری بخوێنن، بە ئەندازەی سێ هێندە.

توێژینەوەکە، کە نزیکەی ٤٧ هەزارو ٢٣٧ منداڵی گرتەوە، کە لە تەمەنی حەوتساڵیدا بوون، لەو منداڵانە بوون، کە لەوانە بیرکاریدا لاوازن، دەرکەوت کە ئەو منداڵانەی لە وەرزی هاویندا لەدایکبوون، زیاتر هەست بە ماندوێتیو بێزاری دەکەن، لە قوتابخانە، بڕوابەخۆبوونیان کەمترە لە هاوڕێکانیان، هەروەها توێژەرەوانی زانکۆی (ئیدج هیل) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەو بڕوایەدان، کە زۆرینەی ئەو منداڵانەی بە دەست وانەی بیرکاریو مامەڵەکردن لەگەڵ ژمارەکاندا دەناڵێنن، کوڕانن.. لەبەرئەوە پێویستە بۆ چارەسەری ئەم کێشەیە ئەو منداڵانە زیاتر لە هاوڕێکانیان خۆیان ماندوو بکەنو لە وانەی بیرکاریدا هەوڵی زیاتر بدەن بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو گرفتەدا، بێگومان هەوڵدانو تێکۆشان چارەسەری سەرەجەم گرفتو کێشەکانە لە زۆرینەی بوارەکانی ژیاندا.



# گێلاس‌و سوودەکانی

گێلاس یەکێکە لە بەرهەمە بەتام‌و بەسوودەکان، کە لەهەموو جیهاندا تامەزرۆیی دەکرێت، سەرباری تامی خۆش‌و شێوەی جوانی، چەندین سوودی هەیە بۆ تەندرووستیی مرۆڤ، تورکیا بە یەکەمین وڵات دادەنرێت لە بەرهەمهێنانی گێلاسدا، دوای ئەو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، پاشان ئێران، ئیتاڵیا، ئیسپانیا، سووریا، ڕوسیا، ڕۆمانیا، ئۆزبەگستان، چیلی‌و فەڕەنسا.

**سوودەکانی گێلاس:**

**١- شێرپەنجە:** گێلاس بڕێکی زۆر بێتاکارۆتین‌و ڤیتامین (C)و ئینسۆسیانینی تێدایە، کە یەکێکە لە بەهێزترینی دژەئۆکسانە سرووشتییەکان، کە بەهۆیەوە خانەکان لە لەناوچوون دەپارێزێت، " کارین ئەنسڵ" کە پسپۆڕی خۆراکییە لە ئەمریکا، بەپێی چەند لێکۆڵینەوەیەك ئاماژە بە توانای ئینسۆسیانین دەکات‌و دەڵێت: ڕۆڵێکی گەورەی هەیە لە کەمکردنەوەی تووشبوون بە شێرپەنجە.

**٢- نەخۆشیی جومگەکان:** یەکێك لە لێکۆڵینەوەکانی ساڵی ٢٠١٢ لە زانکۆی بۆستنی ئەمریکایی، جەخت لە گرنگی‌و بەسوودی گێلاس دەکات بۆ ئەوانەی نەخۆشیی جومگەکانیان هەیە، بە جۆرێك لە ٣٥٪ی ئەوانەی گێلاس دەخۆن، نیشانەی نەخۆشیی جومگەکان تێیاندا کەمتر بەدی کراوە، بەراورد بەوانەی کە ئەو میوەیە ناخۆن.

**٣- کەمخەوی:** گێلاس یەکێکە لە دەگمەنترینی ئەو میوانەی کە ماددەی میلاتۆنینی تێدایە، ئەوەش هۆڕمۆنی ڕێکخەری کاتژمێری بایلۆجیی لەشە، بەپێی لێکۆڵینەوەیەك، کە لە گۆڤارێکی ئەورووپی تایبەت بە خۆراك بڵاوکراوەتەوە، بەکارهێنانی شەربەتی گێلاس، دەبێتە هۆی دابینکردنی میلاتۆنینی لەش ئەویش بۆ باشترکردنی خەوو ڕزگاربوون لە بێخەوی‌و خەوزڕان بەسوودە.

**٤- ڕێجیمکردن:** گێلاس یەکێکە لەو میوانەی بڕێکی پێویست دژەئۆکسانەکان‌و کانزاو ڤیتامینە بەسوودەکانی بۆ لەش تێدایەو یارمەتیی بەرزکردنەوەی ئاستی بەرگری لەش دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا یەکەی گەرمی نزمی هەیە، ئەمەش هۆکارە؛ بۆئەوەی لە پرۆگرامەکانی دابەزاندنی کێش بەکاربهێنرێت، هەروەها یاریدەی دابەزینی ئاستی شەکرەو کۆلیسترۆڵ‌و چەوریی ناوخوێن‌و کەمکردنەوەی هەوکردن دەدات.

"د. کۆڵز" شارەزا لەبواری خۆراك لە ویلایەتی کارۆلینای ئەمریکا دەڵێت: گێلاس میوەیەکی سوپەرە لە بەکارهێنانی پرۆگرامەکانی کێش دابەزاندندا، تەنها یەك کوپ گێلاس، نزیکەی (٧٥) یەکەی گەرمی هەیە.

"د. جونی بودین" پسپۆڕی بواری چارەسەر بەخۆراك دەڵێت: گێلاس ڕێژەیەك ڕیشاڵی تێدایە، یارمەتی ئەوە دەدات بۆ ماوەیەکی زۆر هەست بە تێربوون بکەیت، هەروەها ئاوی تێدایە، بەشێوەیەکی گشتی ئەو خۆراکانەی ئاو لە پێکهاتنیدا هەیە بۆ دابەزاندنی کێش بەسوودە.

**٥- کەمکردنەوەی ئازار:** لێکۆڵینەوەیەك، کە لە زانکۆی "میچگن"ی ئەمریکی کراوە، بوونی ئینسۆسیانین لە گێلاسدا، یارمەتیی کەمکردنەوەی ئازار دەدات بەهەمان کارای چارەسەرکردن بە ئەسپرین.

**٦- گوشاری خوێن:** بوونی پۆتاسیۆم لە گێلاسدا، یارمەتیی کەمکردنەوەی مەترسییەکانی گوشاری بەرزی خوێن دەدات، پۆتاسیۆم پارێزگاری لە هاوسەنگی شلەمەنییەکانی ناو لەش دەکات، هەروەها سەرچاوەیەکی باشی ماددەی کیریستینی دژەئۆکسانە، کە یارمەتیی پاراستنی بۆرییەکانی خوێن دەدات.

**٧- ئافرەتی دووگیان:** بەپێی ڕاپۆرتێکی پێگەی "Baby Center"، گێلاس لە باشترین ئەو میوانەیە، کە سوود بە ئافرەتی دووگیان دەگەیەنن، بەهۆی بوونی ئاسن‌و پۆتاسیۆمەوە، هەروەها گێلاس زۆر دەوڵەمەندە بە ڤیتامین (C)، ئەو ڤیتامینەش بۆ ئافرەتی دووگیان زۆر پێویستە؛ چونکە کار لەسەر بەرزکردنەوەی بەرگریی لەش‌و پاراستنی لەو نەخۆشییانەی کە ڤایرۆس هۆکارە وەك ئەنفلۆنزاو هەڵامەت.

**٨- جوانی پێست:** بوونی ڤیتامینە گرنگەکانی (A – B – C – E) لە گێلاسدا، پارێزگاری لە تەندرووستی پێست دەکەن، ماددەی ئنسۆسیانینی دژەئۆکسان لە گێلاسدا، یارمەتیی هێواش پیربوونی دەموچاو دەدات، هەروەها میلاتۆنین کە یارمەتیی باشی خەوتن دەدات، خەوی باشیش بۆ تەندرووستی پێست بەسوودە، شەربەتی گێلاس بۆ خاڵە ڕەشەکانی سەرپێست بەسوودە؛ ئەگەر بۆماوەیەکی دوورودرێژ بەکاربهێنرێت لە ڕێگەی سڕینی شوێنی خاڵەکان بە شەربەتەکە، هەروەها بۆ نەهێشتنی زیپکە بەسوودە: بەهۆی بوونی ڤیتامین (C)و دژەئۆکسێنەرەکانەوە توانای پاراستنی لە بەکتریاو ڤایرۆسەکان هەیەو یارمەتیی زوو سارێژبوونەوەی برین‌و کەمکردنەوەی هەوکردنی پێست دەدات، لەگەڵ ئەوەشدا یارمەتیی ڕێکخستنی شەکری خوێن دەدات، ئەمانەش هەموو هۆکارن بۆ پاراستنی پێست لە درووستبوونی زیپکە.

**٩- نەخۆشیی شەکرە:** گێلاس بەسەرچاوەی زۆرێك لە ڤیتامین‌و کانزاکان دادەنرێت، کە ڕێژەی شەکر تێیدا نزمە، سەنتەری ئەمریکی بۆ شەکرە، باس لەوە دەکات، گێلاس یەکێکە لەو میوە هەرەباشانەی کە یارمەتیی جێگربوونی ڕێژەی شەکر دەدات لە خوێندا، سەرەڕای بەسوودییەکەی بۆ تەندرووستی لەش.

**زیانەکانی گێلاس:-**

گێلاس بەشێوەیەکی گشتی بێزیانە بۆ پێگەیشتووان، بە پێی ڕاپۆرتێك لەگۆڤاری "العلم والطبیعة"، گێلاس یەکێکە لەو (١٠) میوە هەرەگرنگەی کە لە گەڵاو ناوکەکەیدا ژەهری تێدایە، بەهۆی بوونی ترشی سیانیدی ژەهراوی لە گەڵاو ناوکەکەیدا، هەربۆیە پێوستە خۆمان لە خواردنی گەڵاو ناوکی گێلاس بەدوور بگرین.

٥٠ مۆم بۆ ڕۆشنکردنەوەی ڕێگەتان

مۆمی ٣٥ بۆ کوڕو کچە لاوەکانم

# جیاوازی قبووڵ بکەن

و: ئاسیا صەلاح

خەڵکی هەردەم جەخت لەسەر کۆدەنگیو هەماهەنگی دەکەنەوە؛ چونکە دەزانن جیاوازییو پێکنەهاتن ترسێنەرە، ڕەنگە ناکۆکی تاڵی لێ بکەوێتەوە؛ ڕاستە وایە، بەڵام سرووشتی خەڵکی وەهایە، کە داوا لە هەموو کەسێك دەکات لەگەڵیدا بگونجێتو بسازێت، وەلێ لەبیری دەکات کە هەمان شت لە خودی خۆیشی داواکراوە!

کچو کوڕەکانم، ئێوە لە سەردەمێکدا دەژین، کە هەموو شت لە فراوانبوونو گۆڕانکاریدایە، هەڵبژاردەکان لە هەموو لایەنێکدا لە زۆربووندان، ئەمەش وا دەکات سنوورەکانی جیاوازی، فراوانتر بێت لەوەی لە ڕابوردوودا بوونی هەبووە، بۆیە وا پێویست دەکات کە زۆر بەباشی لە بابەتەکانی کۆکبوونو پێکنەهاتن بگەین. ڕەنگە سوودەکەی ئەمانە بێت:

جیاوازی یەکێکە لە سوننەتەکانی خودای گەورە لە درووستکراواندا، ئەمەش لە فەرموودەی خودای گەورەدا بەدیدەکەین کە دەفەرموێت: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّلْعَٰلِمِينَ ﴾ الروم: ٢٢، (واتە: یەکێکی دیکە لە نیشانەکانی توانای خودای گەورە، درووستکردنی ئاسمانەکانو زەویو جیاوازیی زمانتانە کە هەر میللەتێك بە زمانێك دەدوێتو جیاوازیی ڕەنگی پێستتانە، ئەمە چەندین نیشانەی لەسەر گەورەیی خودا تێدایە بۆ هەموو جیهان)، هەروەها خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً ۖ وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ ۚ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ ﴾ هود: ١١٨ - ١١٩. (واتە: ئەگەر خودای تۆ، مەیلی ببوایە بەرەی بنیادەمی هەموو دەکردە یەك ئوممەتو هەموو موسڵمان دەبوون، ئەم نەوەی ئادەمە، بەردەوام ناجۆرو لەیەك جیان، هەندێکیان باوەڕدارو هەندێکیان بێباوەڕن، تەنها ئەوانە نەبێت کە خودا هیدایەتی داونو ئیمانیان هێناوە لە ناو خۆیاندا یەکنو جیاوازییان نییە)، زانایان لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا: ﴿ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ ﴾ دەفەرموون: مەبەست تێیدا بەخشندەییو جیاوازییە؛ چونکە خودایە بەندەکانی دەبەخشێت، بەندەکانیشن کە جیاوازن لە نێوان یەکدا. لەوانەیە لە نێوان سەدان لە ناسراو خزماندا بگەڕێیت، کەسێك نادۆزیتەوە بە تەواوی هاوڕا بیت لەگەڵتدا لە بیرو سۆزو مەزاجیدا...

جیاوازیی ئەقڵو ناخو ئارەزووەکانمان، هاوشێوەی جیاوازیی ڕوخسارمانە، کە زۆر دەگمەنە دوو ڕوخسار بدۆزیتەوە، لە هەموو وردەکاریو تایبەتمەندییەکدا وەك یەکبن، بەڵام ئەگەر بەگشتی سەیر بکەین، لە هەموو دەموچاوێکدا دوو ڕوومەتو دوو چاوو دوو برۆو یەك ناوچەوانو لووتو دەمو چەناگە هەیە.

کچو کوڕەکانم، هەر بەم شێوەیە خەڵکی شتە گشتگیرەکان کۆیان دەکاتەوە، چەند تایبەتمەندییەکی بچووك جیایان دەکاتەوە، دەبێت ئەمە وەکو خۆی قبووڵ بکەین.

خودای گەورە تایبەتمەندی جیاوازی بەخشیوە بە مرۆڤەکان، تێیاندایە گەشبینە، هەیانە نائومێدو گومان خراپن، هەندێکیش ئارامگرو هێمنو لەسەرخۆن، کەسانێکیش تووڕەو وەڕسو توندن... ئەمەش دەبێتە هۆی زۆرێك لە بەرکەوتنو ناکۆکیی ڕۆژانە.

کچو کوڕەکانم، خەڵکانێك هەن لە خێزانێکدا گەورەبوون، تاکەکانی بە نەرمونیانیو نازەوە مامەڵەیان کردووە، بۆیەش وا گومان دەبەن کە ژیان ئاسانەو خەڵکیش هەموو کەسانی باشن. گەرچی هەندێکی دی لە خێزانێکدا گەورەبوون، ستەم باڵی بەسەردا کێشاوە: ستەمی باوك، یان زڕباوك، یان زڕدایك... هەر بۆیەش بە چاویلکەیەکی ڕەشەوە، دەڕوانێتە جیهانو گومانی خراپ بە هەر کەسێك دەبات، کە بەرەو ڕووی دەبێتەوە.

### ئەمە چی دەگەیەنێت لای کچو کوڕەکانم؟

با کەستان وا سەیری خۆی نەکات، کە بناغەی هەموو شتەکانە، پێویستیش ناکات کەسەکانی دیکە، وێنەیەکبن لە تۆ. هەر کەسەو شتانێکی هەیە بۆ پێداهەڵدانی، بۆ تانەلێدانی، ڕاستیان هەیەو هەڵەشیان هەیە.

هەوڵ بدەن لە تێڕوانینو باکگراوندو بارودۆخی بەرامبەر بگەن، با لێبووردەییو پاساو هێنانەوە هاوڕێ بێت لەگەڵ هەموو ئەوانەدا.

وا بڕوانە جیاوازی کە سەرچاوەی سامانو دەوڵەمەندیو هەمەجۆرییە، نەك شتێك کە نەتەوە لاوازبکات، یان ڕیزەکانی تێك بشکێنێت، ئەگەر ئێمە لەسەر شتە گشتگیرەکان ڕێك بکەوین، جیاوازی لە شتە لاوەکییەکاندا، زیانێکی ئەوتۆی نییە.

کاتێك شتێك گوماناوییەو هەوڵی وتووێژی لەسەر دەکرێت، ئەوکات هەڵبژاردەی ڕاستە لەگەڵ ڕای زۆرینەدایە، بەڵام کاتێك جیاوازیی خەڵکی لەسەر شتە دیارو ڕوونەکانە، ئەو کات ڕاستی لای خاوەن حەقەو لای ئەوانەیە کە بەڵگەیان لایە، هەرچەندە ژمارەشیان کەم بێت، ئەمە ئەوەیە کە ئیبن مەسعود ڕەزای خودای لێبێت گوزارشتی لێدەکات، کە دەفەرموێت: (کۆمەڵ واتە: لەسەرحەقبوون، تەنانەت ئەگەر بە تەنها خۆتیش بیت)، ئەگەر لە لادێیەکدا تەنها پیاوێك نوێژی دەکرد، ئەو پیاوە بە کۆمەڵەکە ئەژمار دەکرێتو دەبێت خەڵکی بگەڕێنەوە لای ئەو.

با خۆمان تۆمەتبار بکەین لە جێگەی تۆمەتبارکردنی کەسانی دی.

پشت بە گفتوگۆو دانووستان ببەستن؛ بە ئامانجی گەیشتن بە باشترین ئەنجام، لەو بابەتانەی کە جیاوازی تێدایە.



زەردەخەنــە، زمانێکی ناســکو ڕازاوەیە هەمــوو کەس لێی تێ دەگاتو پێویست بە وەرگێڕان ناکاتو پەیامی خۆشەویستیو دڵسۆزیو ڕاستگۆیی دەگەیەنێتو بەزووترین کات زۆرترین کاریگەریی بەجێ دەهێڵێــتو ئەوەی ناتوانرێت بەزۆر بەدەســت بێت، بە زەردەخەنە بەدەســت دێــت، زەردەخەنە کاریگەریی ئەرێنــی زۆر گەورە بەجێ دەهێڵێــتو لایەنە دەروونیو جەســتەییەکان چالاك دەکاتو توانای بەرهەمهێنانو بیرکردنەوە باشتر دەکات. وتراوە پێکەنین باشترین چەکی شــەڕە لەدژی ناخۆشییەکانی ژیان، ئەزیزان باشترین ڕێگاشە بۆ دەســت لەملکردنی ژیانو گونجان لەگەڵیداو بەسەربردنی تەمەن بەشێوەیەك کە دوور بێت لە خەمۆکیو نیگەرانیو دڵەڕاوکێ.

پێکەنیــن کلیلــی کردنەوەی دڵــەکانو هەنگاوی درووســتکردنی پەیوەندییەکانو هەناســەی بەردەوامی خۆشەویســتییەکانە، پێکەنین پەڕجوویەکــە، هــەر کاتێــك بەکارت هێنــا، ئەنجامەکــەی دەبینیت لــە ڕەواندنــەوەی خــەمو نیگەرانییــەکانو دۆزینەوەی چارەســەری گرفتــەکانو لابردنــی ڕقو کینــەکانو بەیەکــەوە بەســتنی دڵو دەروونــەکان، وەك لەم چیرۆکەدا بۆمــان ڕوون دەبێتەوە: (منداڵێکی کلێنســفرۆش کە پاکەتە بچووکەکانی لەسەر دەستە وردەکانی دانابوو لەناو باخچەیەکــدا بەلای ئافرەتێکدا تێپەڕی کــە بەخەمو پەژارەوە دانیشتبوو، فرمێسك لەچاوەکانی دەهاتنە خوارەوە، ئەویش لێی نزیك بــووەوەو زەردەخەنەیەکــی پڕ لەهیواو بەرائەتی بــۆ کردو پاکەتێك کلێنســی خستە دەســتەکانیەوەو بێئەوەی چاوەڕوانی پارەی لێ بکات بەجێی هێشــت، بەم زەردەخەنە جوانەی ئــەم منداڵە، دڵو دەروونی ئارامی گرتو خێرا دەســتی کرد بەجانتاکەیداو مۆبایلەکەی دەرهێناو نامەی بۆ هاوسەرەکەی نووسی کە"بمبورە من هەڵە بووم" ئەم نامەیە گەیشــت بەهاوسەرەکەی کە بەپەژارەوە لەچێشتخانەیەکدا دانیشتبوو، زۆر دڵخۆشی کرد هەستاو ٤٠ دۆلاری بەخششدا بەگارسۆنەکەو کەخۆی تەنها بایی ٥ دۆلار شتی خواردبوو، ئەم کرێکارەش زۆر بەو بەخششە دڵخۆشــبوو، لەگەڕانەوەیدا لای ئەو ژنە پیرەی کە شیرینی دەفرۆشت، بایی دۆلارێك شیرینی کڕیو بیست دۆلاریشی پێ بەخشی، ژنە پیرەکە جلوبەرگی تازەی بۆ نەوەکەی کڕیو ئێوارە ڕۆیشتەوە بینی نەوەکەی بەزەردەخەنەیەکی پڕ لەهیواوە چاوەڕێیەتی).

بۆیە هەمیشــە بەزەردەخەنەی هیواوە بژینو بۆ خۆشییەکانی ژیان پێ بکەننو بە سەختیەکانیشی پێ بکەننو دوای شکستەکانیش پــێ بکەنن، بەو پــەڕی ئازایەتیەوە پێیان بڵێــن، هیممەتو توانای ئێوە لەوە زیاترە، ئەوان بتوانن بتانوەســتێننو وەرەزو هەراسانتان بکەنو کۆڵ بدەنو دەست هەڵبگرن لەبەرەو پێشچوونو گەشەکردن، زەردەخەنەکانتان وزەیەکی ئیجابیە دەیدەنە هاوڕێو هاوکارەکانتانو شــەحنی لایەنــی مەعنەوییــان دەکەنــەوە، لەکۆنیشــەوە وتراوە زەردەخەنــە واجبێکی کۆمەڵایەتییە. ســوودو قازانجی زەردەخەنە زۆرو زەوەنــدەو خۆشــیو کامەرانــی درووســت دەکاتو دڵــەکان وابەســتەی یەکتر دەکات ڕقو کینەکان دەشواتەوەو پەیوەندییەکان بەهێزو توندوتۆڵ دەکات، ئەوەتا پێغەمبەر(سەلامی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (تَبَسُّمُكَ في وَجهِ أُخيكَ صَدَقةٌ) واتە: زەردەخەنەیەك کە بەڕووی براکەتدا دەیکەیت، خێرو چاکەیە.

ئەزیــزان.. توێژینــەوەی زۆر لەســەر پێکەنین کــراوەو ڕوون بووەتەوە، کاریگەریی زۆرباشــی هەیە لەسەر تەندرووستیی مرۆڤو دەبێتە هــۆی بەرزبوونەوەی ئاســتی کۆئەندامــی بەرگریی لەشو جەستەی مرۆڤ لەکاتی پێکەنیندا، هۆرمۆنی ئەندرۆفین دەردەدات، کە دەبێتە هۆی هەســتکردن بە ئاسوودەییو بەختەوەری، تەنانەت ئەگەر پێکەنینەکە ســاختەش بێت، هەروەها لێکۆڵینەوەکان، ئاماژە بەوە دەدەن، کە لە پێکەنیندا ٥٣ ماســوولکەی دەموچاو بەکاردێت، کە دەبێتــە هۆی جوان هێشــتنەوەی دەموچاوو ســووتاندنی وزەو بەدووربــوون لە کێشــی زیــادە، پەیمانــگای ئۆربیــت کومپلیت لە توێژینەوەیەکــدا، دەری خســتووە کە لە ٦٩٪ی خەڵــك پێیان وایە پێکەنین لە هۆکارەکانی تری ڕازاندنەوە جوانترە بۆ مرۆڤ.

دەبــا خۆمان بڕازێنینەوە بە زەردەخەنەو پێکەنینو هەمیشــە بەهیواوە، بڕوانین بــۆ ژیانو زەردەخەنە بگوازینەوە بۆ یەکدی، تا دڵو دەروونمان شادو گوشادبێتو لەخەمو پەژارە بەدوور بین.

# بۆ ژیان
# بە ژیان پێ بکەنن!

زاهیر زانا سەیدگوڵ



# وەڵامی بەجێ

01

دەگێڕنەوە زانایەکی بوێر، لە کۆڕی دەسەڵاتدارێکی ستەمکاردا دانیشتبوو، یاری بە تەسبێحەکەی دەکرد.

کاتێك لە کۆڕی دەسەڵاتدار هاتە دەر، دەستوپێوەندەکەی لە زاناکەیان پرسی: چۆن لە کۆڕی سەرۆکدا، یاری بە تەسبێحەکەت دەکەیت؟

ئەویش زۆر بێباکانە وەڵامی دانەوە: کەسێك پارەی میللەت بە ڕاستو چەپدا تەخشانو پەخشان دەکات، پیاوە بلیمەتو زیرەکەکان دەخاتە کونجی زیندانەوەو شەرم لە گەندەڵییەکانی خۆی ناکاتو ئێوەش متەقتان لێوە نایەت، کەسێك هەق بە خۆی دەدات، یاری بە چارەنووسی ملیۆنان کەس بکات، بەڵام ئێوە هەق بە من نادەن، بە تەسبێحەکەی خۆم یاری بکەم!

02

ڕۆژێك خانەدانێك، دەچێت بۆ شێتخانەیەك، شێتێکی لاو سەرنجی کابرای خانەدانی ڕاکێشاو کەوتە نێو گفتوگۆ لەگەڵیدا، بۆی دەرکەوت؛ هێنانی ئەم گەنجە بۆ شێتخانە؛ تا سەر ئێسقان ناهەقییە.. دواتر خانەدانەکە بۆ ژەمی شێو، شێتەکەی بردەوەو لە پێشدا داوای کرد؛ مەیو بادە بهێنن.. پاشان پێکێکی بۆ شێتەکە تێکرد، بەڵام شێتەکە لێی وەرنەگرت.

خانەدان پێداگری کردو ئەو هەر وەرینەگرت، پرسی بۆچی ناخۆیتەوە؟ شێتەکە گوتی: قوربان تۆ مەی دەخۆیتەوە، تاوەکو منت لێ بێت، ئەگەر من بیخۆمەوە، وەکو کێم لێ دێت؟!

03

حەجاج لە شۆڕشەکەی ئیبنوئەشعەسدا، چەند کەسێکی بە دیل گرت، یەکێك لە دیلەکان ڕووی لە حەجاج کردو گوتی، قوربان، من مافێکم لاتە؟حەجاج پرسی: چ مافێك؟

دیلەکە گوتی: ڕۆژێکیان سەرکردەکەمان، واتە: ئەشعەس، قسەی پێ گوتی، منیش بەرپەرچم دایەوەو بەرگریم لێکردی، حەجاج گوتی: کێ شایەتی ئەم قسەیەتە؟

یەکێك لە دیلەکان هەستاو گوتی: قوربان من شایەتی بۆ دەدەم، کە ئەو ڕووداوە ڕاستە، واتە: ئەو بەرگری لە تۆ کرد، لای سەرۆکەکەی.

حەجاج ڕووی لە شایەتەکە کردو گوتی: ئەی تۆ بۆچی بەرگریت لێ نەکردم، لەو کاتەدا؟

دیلەکە زۆر ئازایانە گوتی: لەبەرئەوەی من ڕقم لێتە، جەنابی فەرمانڕەوا!

حەجاج فەرمانی کرد: یەکەمیان ئازاد بکەن، لەبەرئەوەی مافی لەسەرمە!

دووەمیشیان ئازاد بکەن، لەبەر ڕاستگۆییو بوێرییەکەی!

# گۆرانی بڵێ بۆ ژیان

مژدە بۆ ئەو کەسانەی
ئارەزووی تێکۆشان دەکەن،
گەنجینەی ناوازەو موعجیزەی
گەورە، چاوەڕوانیان دەکا.
-ئیزاك سینجر- نووسەر

تەنانەت ئەوانەش کە وا دەزانن
مرۆڤ بێ ویستی خۆی دەژیو
هیچ ئیرادەیەکی نییە، پێش ئەوەی
لە ڕێگاکە بپەڕنەوە، سەیری
ڕاستو چەپی خۆیان دەکەن.
-ستیڤن هوکینگ- فیزیاکەر

لە ڕێساکانی ژیان کە پێویستە
هەرگیز لەیادت نەچن:
١- باوەڕ بە هەموو ئەو شتانە
مەکە، کە لەبارەتەوە دەنووسرێن
٢- پارەو سامانی زۆر کۆ
مەکەرەوە.

زۆر ئاسانە سەربەخۆ بیت،
کاتێك پارەت هەیە!
بەڵام بتوانی سەربەخۆبیتو
پارەشت نەبێ، ئەمە تاقیکردنەوەی
ڕاستەقینەیە!
-ماهالیا جاکسون - گۆرانیبێژ

لە دڵی دژواریو لوتکەی
سەختیدا، هەمیشە مرۆڤ
سوکنایيو دڵنیایی دەدۆزێتەوە.
-ئیکسۆپیری- نووسەرو فڕۆکەوان

ئەگەر کاری گەورەمان
پێ نەکرا، دەتوانین کاری
بچووك بکەین، بەڵام
بەخۆشەویستییەکی گەورەوە.
نەنە تریزا

# لەنزیکەوە بمناسە

سالم ئەحمەد مستەفا

کەی تۆ بوویتە هاوسەفەرم؛ تا تێبگەیت چی لەم دونیایە تێدەگەم؟ کەی تۆ بوویتە هاوژینی من؛ تا مەرگەساتی ژیانی چەوساوەو ژێردەستەکان ببینیت؟ کەی لەگەڵ مندا گەشتێکت کرد؛ تا سەیرو سەمەرەکانی دونیا ببینیت؟ کەی تۆ بوویتە هاودەمم؛ تا تاڵاوو سوێراوی ژیانی هەژاران بچێژیت؟ کەی تۆ هاتی لەگەڵمدا شەوان بێداری بکەیت؛ تا بەدەم هیواو ئاواتەکانی هەتیوو بێنەوایاندا ڕۆژ بکەینەوە؟ کەی تۆ توانیت هاوکارم بیت؛ تا ئاهوو نزولەو کزۆڵی هەتیوانو نەدارانو دەردەداران ببیستیت؟ کەی هاتیتو هاوخەمم بیت؛ تا بەدەم سەرگەرمی بەدی هاتنی خەونەکانی چەوساوانو مەزڵوومانـدا بتلێینەوەو وەکو کۆرسێك بەدەم داواو پاڕانەوەوە، لەگەڵ واندا. توخوا ئیدی خودایە بەسە بڵێینەوە؟

کەی وەکو من، نەبوونی بێوەژنو بێکەسانو بێدەسان، کسپەی لەجەرگت هەڵسان؟

کەی وەکو من، سەرنجت دا حاڵی شڕی بێخانەو لانەو دڵۆپەی بارانی زستانو سەقفی ڕزیوی کرماویو گەنیویان ببینیت؟

لەگەڵمدا بە؛ تا کشەی هەناسەی ساردم بۆهەناسەساردانی بێناوونیشان ببیستیتو بەڕێمان بخا بۆ خزمەتیان.

پەیوەندیی خۆت لەگەڵمدا مەپچڕێنە، ڕەشبین مەبە، گەشبینانە لێم بڕوانە، ڕوی خۆتم لێ وەرمەگێڕە پەلەمەکە، زۆر بە وردی بۆم بڕوانە، بەچاوی کەس من مەبینە، گوێ ڕادێرە، گوێ بیستم بە، لەخۆمەوە بزانە کێمو بمناسە، چپە مەکە. بوێرانە دەنگ هەڵبڕە بێ موحیببەت ئەم ژیانە ساردو سڕە،

ئاخر تۆ کە لە من دووریت، چۆن دەمناسیتو بڕیار دەدەیت، کە من کێمو چی دەکەمو چیشم دەوێت، دە وەرە لە من تێبگە؛ تاوەکو دڵمان بسرەوێت. وەگەرنا، تکات لێ دەکەم، لە دوورەوە بۆم مەڕوانە، بەنارەوا ناوم مەنێ، بەئارەزووی نەخۆشی خۆت ناووناتۆرەم لێ مەنێ، من کەسێکم؛ تا دوور بیت لێم، نامناسیتو نازانی کێم، پەی بە مەبەستەکانم نابەیت، دڵنیا بە کە ناتوانیت پێناسەم کەیت.

نزیك بەرەوە، وەرە ناو مەملەکەتی عیشقو خۆشەویستیی عیشقی چاکەو چاکەخوازی، عیشقی پاکی مرۆڤسازی؛ تا بەردەوام بین لە ڕێگاو ئاوڕ لە کەس نەدەینەوە؛ چونکە ناحەز دەیەوێت بوەستینو دوابکەوین لە کاروان، کاروانمان مرۆڤانەیە، برایانەیە، (إیثار)بەرزترین پلەیەتی، سینەسافی نزمترین پلەیەتی.

وەرە دەستت بخەرە ناودەستم؛ پەیمان بدەین خزمەتکاری مرۆڤ بینو بۆ بەختیاری تێکۆشین، بەرگو کاڵای ڕەوشتبەرزیی جوان بپۆشین؛ تا دەست بەسەر دڵ بهێنین، لەپێش بەهەشتدا، بەدەم وشەی ئۆخەیەوە، ئاسوودەیی دامان بپۆشێتو شەربەتی ژیان بنۆشین.

من درەختێکی بەردارم، ڕیشەکانم لەناو زەویدا جێگیرەو لقو پۆپم لە ئاسمانە، لەگەڵ ژینگەدا سازگارم، ئامادەی بەردتێگرتنو ئازاردانم، چون دەزانم، گەوجو چڵێس، گەلێ زۆرن، نازانن دەدەن ئازارم، ئێستا دەزانی ئەمن کێم؟ ئا ئەوەمو دڵنیابە کە ناگۆڕێم، هەرئەوەشە دوابڕیارم؛ تا تێبگەم باش پێبگەم، هەمیشە دەست بە بڕیارم.

# تیاچوونی ئەوانەی لەگوفتارو کرداردا زیادەڕەوی دەکەن

(ئەحمەد زویل) هەڵگری خەڵاتی نۆبڵە لە زانستی فیزیادا، لەبارەی گرنگترین خەسڵەتەکانی زانای ڕاستەقینە پرسیاری لێکرا، چۆن بتوانرێت جیاوازی بکرێت، لە نێوان زاناو ئەوەی بانگەشەی زانین دەکات؟

وتی: هەرکەسێك باسی گەورەیی، توانا، زانستو پێگەیشتوویی خۆی کرد، گوێی لێ مەگرە، زانای ڕاستەقینە، تا بە پەیژەی زانستدا سەر بکەوێت، ڕووبەری نەفامیی زیاتری لێ دەردەکەوێتو لە ڤەڵەمڕەوی خودای بەدەسەڵاتدا چەند بچووکە، ئەو لەدەریای زانستو زانیندا تەنها پنتێکە؛چونکە گرنگترین زاراوەی پایە بڵندی ئەوەیە، خۆت بەفێرخوازێك ببینیت لە قوتابخانەی ژیاندا، یەکەم خەسڵەتی گەورە پیاوان ئەوەیە، لەسەر سنوری ڕاستی زانینەکانیان ڕادەوستن، لە توانایاندایە خوێندنەوە بکەن بۆ مەودای پەیبردن بەشتەکانو تێگەیشتن لە دەوروبەر.

کاتێك خودای بەدەسەڵات پێمان دەڵێت، کە زانایان زیاد لە گشت مەردم لەخواترسن؛ چونکە لە گەورەییو دەسەڵاتی پەروەردگار تێدەگەن، پەروەردگار پێمان دەڵێت، کە زانستو زانین، دەرگای ڕاستیو گەورەییو پایەبڵندییە، بەشێوەیەك ﴿ وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ ﴾ یوسف: ٧٦.

ئەوانەی شانازی دەکەن بەوەی هەیانە، لووتبەرزانە خۆیانی پێوە ڕادەنێن، ماوە ناماوەیەکو ئەوەی دەیزاننو هەیانەو بەبیری کەسانی دیکەی دەهێننەوە، لەڕاستیدا کەموکورتیەك لە پێکهاتەی دەروونیاندا هەیە، بێباوەڕن بەتوانای خۆیان لەوەی بەردەوام هەڵبکشێن، لە سەرووی ئەمانەوە، پەینەبردنە بە گرنگترین ڕاستی لە ڕێسای گەردووندا، ئەوەش کە زانستو ڕاستیو زانینی ڕەها، کەس خاوەنی نییە، گەورەی تەنها بۆ خودایە.

ئەو کەسانە خۆیان بە پێگەیشتوو، زاناو خاوەن دارایی دەبینن، لەوانەیە ڕۆژێك دابێت، کەسێکی سادە، کە لە خەیاڵی ئەواندا نییەو هیچ حسابێکی بۆ ناکەنو ئاوڕی لێ نادەنەوە، ئابڕوویان بەرێت.

لەم نێوەندەدا، چیرۆکێکی ڕەمزیم بیر کەوتەوە، کە جیاوازیی نێوان دوو کەس دەردەخات، کەسێکیان بەزانینو ڕێزلێگیراوییەکەی لەخۆی بایی بووە، کەسێکی دیکەیش، ڕۆژگار لە قەپێلکی خۆیدا گرمۆڵەی کردووە، سەرباری زیرەکیو دووربینییەکەی، لەبیری کەسدا نییە.

ڕۆژێك منداڵێکی بچکۆلانە، خۆی کرد بە دوکانی سەرتاشێکدا، کاتێك سەرتاشەکە، کوڕێژگەکەی بینی، بەگوێی ئەو پیاوەی لەژێردەستیدا بوو چرپاندی: ئەم زارۆکە، کاڵفامترین منداڵە لە دنیادا، ببینە ئێستا ئەمەت بۆ دەسەلمێنم.

پاشان لە زارۆکە نزیك کەوتەوە، لە دەستێکیدا بڕی هەزار دیناری دانابوو، لە دەستەکەی دیکەیدا بڕی پێنج سەد دینار، پاشان بە منداڵەکەی وت: ژیکەڵەکەم کامیانت گەرەکە! منداڵەکە پێنجسەد دینارەکەی وەرگرتو لێیدا ڕۆیشت...!

لێرەدا، سەرتاشەکە بەگاڵتە پێکردنەوە، زەردەخەنەیەکی کرد، بەو تاقیکردنەوەیە دڵخۆشبوو، قاقایەکی بۆکرد، بەپیاوەکەی وت: ناڵێم کەسێکی کاڵفامە، گشت ڕۆژێك هەمان کردەوە دووبارە دەکاتەوە، بەشە کەمەکە دەباتو دەڕوات.

کاتێك پیاوەکە تەراشیان بۆ کردو قژیان ڕێکخستەوە، لە دوکانەکە هاتە دەرەوە، منداڵەکەی بینی، لە دوکانی شرینیفرۆشێك بەو بڕە پارەیەی لە سەرتاشەکەی وەر گرتبوو، پارچەیەك شیرینی کڕی، کە ئارەزووی دەکرد. حەزی خۆبردنەپێشەوە، بەسەر پیاوەکەدا زاڵبوو، پرسیاری لەزارۆکە کرد: بۆچی هەزاردینارەکەت وەرنەگرت، لەبری ئەوە، دراوە کەمەکەت هەڵگرت؟

لێرەدا منداڵەکە، تەواشای نێوچاوی پیاوەکەی کردو وتی: ئەگەر ڕۆژێك بڕە زۆرەکە وەربگرم، کایەکە کۆتایی دێت!!

بێفیزی ڕۆزیی پەروەردگارە، گەورەییو لەخۆباییبوون ئیستدراجی شەیتانە» واتە: ڕۆچوون، یان داکشان بە تاوانو خراپەدا، تا ئەندازەی فەوتانوتیاچوون»، چەند زۆرن ئەوانەی کەوتنە داوی لەخۆباییبوونەوە، دنیایان پڕکرد لەباسی خۆیانو بەکەمگرتنو گاڵتەکردن بە بەرانبەرەکەیان.

پێشەوا شافعی پێمان دەڵێت: (هەر کەسێك زیاد لەوەی هەیە، باسی خۆی بکاتو ناوی خۆی بهێنێت، پەروەردگار دەیگەڕێنێتەوە بۆ بەها ڕاستەقینەکەی)، بەڵام ئەوانەی بێفیزییان لەنێو باڵیاندا پێچاوەتەوە، بەڕاستی گەورە پیاوانن.

هاوڕێ وەك ئەو سەرتاشە نەفامە مەبە، کە بە زیرەکیی پووچی شانازی دەکرد، بە هەڵەی کەسانی دی دەخەنییەوە؛ بۆئەوەی لەژیاندا بەخەیاڵ نەژیت، لەولاشەوە خەڵکانی دی گەمەت پێ بکەن!

پوختە: بەڕاستی گەورەیی تەنها خودا دەیزانێت، بەخۆتو زانستت گومڕا مەبە، دەستی زەبوونی بگرە، لەلایەن پەروەردگارەوە بەبێئەوەی داوای بکەیت، پایە بڵندو شکۆدارو ڕێزلێگیراو دەبێت.

و: چیمەن لەتیف



# دادوەر

لەدێر زەمانەوە، دەگێڕنەوە: پیاوێکی خوداناس، پەروەردگار ماڵێکی زۆری پێ بەخشیبوو، خێرو چاکەی زۆری لەو ماڵە دەکرد، شۆرەتی بە هەموو لایەکدا بڵاوبووبووەوە، گەورەیو بەرچاوتێری بەنموونە دەهێنرایەوە.

ڕۆژێک ڕێبوارێک دەرگەی کوتا، داوای خواردنو خواردنەوەی کرد. خاوەن ماڵ لەڕووی ڕێبواردا بچووکی پیشاندا، لە میواننەوازیدا زیادەڕەوی کرد، زیاد لەوەی ڕێبوارەکە ئارەزووی دەکرد خستیە بەردەستی، پیاگە خاسەکە، ویستی خودا بەیادی میوانەکەیدا بهێنێتەوەو سوپاسو بەخششی پەروەردگار لەکن میوانەکەی باس بکات.

ئەوەندەی خۆش بوو، خانە خوێ لەو بارەوە دەستی بەگفتوگۆ کرد، ڕێبوارەکە وەك تیر لە کەوان، بەرەو ڕووی خانەخوێکەی دەرچوو، دایە بەر دەمرێژی قسە، سەرەتا کەوتە قسەکردن بەخانە خوێکەی، پاشان کفرکردن بەرانبەر بە پەروەردگار، بە وتەی نەشیاو بەرانبەر پەروەردگار، ڕووی کردە کابراو وتی: ئەوە چ دادگەرییەکە، منی هەژار خستووە، لێگەڕاوە نەبووبم، کوا بەزەییو دادپەروەریی خودا لە کوێدایە؟

ئەوەتا دەبینی بە سواڵ دەژیم، ئەو چتێکم پێ دەدات، یەکێك قاپی حەوشەکەی بە ڕوومدا دادەخات، ئاخر خودا بەخششی خۆی بۆملیۆنەها کەس هەڵڕشتووە، بەڵام دنیای لەمن هێناوەتەوە یەك، وازبێنە بامن خواردنو خواردنەوەکەم بخۆمو بخۆمەوە، تۆ لەخولای خۆت نزدیك بەرەوە.

دوای ئەوەی جۆرەها هەڕەشەو جمێنی ڕووبەڕوو کرایەوە، مەردمە خوداناسەکە، بەڕووی نەدارەکەدا هەڵشاخا، پاشان وەك شێتۆکەیەك هەستایە سەر پێو فەقیرەکەی لەماڵ وەدەر نا.

پیاوە خوداناسەکە، شەوی بە ئەستغفیروڵڵاو داوای لێبوردن لە پەروەردگار کردە دوو کوتەوە، تا خەو بەسەریدا زاڵبوو.

لەخەویدا فریشتەیەك، کە لەلایەن پەروەردگارەوە ڕەوانە کرابوو بەو میوانیو پرسیاری لێکرد: کارێکی چاکەت کرد، بە بەخشین پاداشتت دەدەینەوە، لە بەخشندەو چاکەکارەکان دێیتە حساو، بەڵام وەدەرنانی هەژارەکە لەماڵەکەتدا، پاداشتی چاکەکەتی زایەکرد!

بەسەرسوڕمانەوە پیاوەکە وتی: چۆن دەری نەکەم ئەو وتەی ناشیاوی بەرانبەر پەروەردگار بەزاردا هاتووە، (خودا ناوی هەمیشە پاكو بەرز ڕاگیراوە)؟! چۆن تاڵاوی دەرخوارد نەدەم، ئەو هێرشی کردە سەر بەدیهێنەری زەویو ئاسمانەکان؟!

بۆ ڕەزامەندیی خودا تێرم کرد، بە خاتری خولای وەدەرم نا. لێرەدا فریشتەکە وتی: کێ سرووشی بۆ ناردی کە وێستانت بەڕووی ئەو کابرا نەدارەدا، نزیك بوونەوەیە لەخودا، بەو هێرشە توندە بەسەریدا زاڵبوویت، ئەم مرۆیە زیاد لەشێست ساڵە، ئەمە حاڵێتی، خودا بەستەمو جەور تۆمەتبار دەکات، شەست ساڵە بوێرە بەرانبەر پەروەردگار، بێباوەڕە بەقەزاو قەدەری خودا، لەگەڵ ئەوانەشدا، خودا ڕۆزی دەداتێو ئەم دنیا پانوبەرینەشی بۆ ڕام کردووە، ئەگەر ویستی لەسەر بوایە، بەناخی زەویدا دەیبردە خوارێو دەیکردە پەندو نموونە بۆ کەسانی دی.

شەست ساڵە، خودا ئارامی گرتووە، تۆ بۆچەند خولەکێك ئۆقرەت لێ بڕا. باشتر وابوو خودای پێ بناسێنیت، بۆچەند ساتێك بەرگەی نەفامییەکەیت بگرتایە، بەئەندازەی زانینت، خودات پێ ناساندبا، لەوانەیە ئەو کات، هەستی بەڕاستی کردباو خەجاڵەت بووایە، ئەوکات تۆش پەیامەکەت بەشێوەیەکی جوان دەگەیاند، تەنانەت ئەگەر باوەڕیشی نەهێنابا، ئەوکات گومڕاییەکەی، بێبەری نەدەکردی لە پاداشتو چاکە.

لە ژیاندا کەسانێك خۆیان دەکەنە قازی، قانوون دەردەکەن، سزا دادەبەزێنن، ڕۆڵی دادوەرو پیاوکوژیش دەبینن. یەکێکیان وا گومان دەبات، ڕاستی تەنها لای ئەوە، بەئارەزوو قسە ناکات. لێبوردەیی بەرتەسك دەکەنەوەو فەرمان دەردەکەن.

زۆرترین کارەساتە مرۆییەکان، لەوەوە سەرچاوە دەگرێت، کەسێك ڕاستییەکان قۆرخ بکات، لەسەر کەموکورتییەکان لێپێچینەوە لەگەڵ خەڵکیدا بکات، هەرکات ئەوان وەك ئەو نەبوون، سزایان بۆ دەرکات.

زۆر کات ئێمە، ناڕەوا بەڕاست دەبینینو بۆی دەمارگیر دەبین، زۆرجاریش ڕاستیمان بەناڕەوا پیشان دەدرێت، بەرانبەری دەمارگیر دەبین.

بۆئەوەی لەم پێکداچوونە دەربازبین، گرنگترین دەرگا، دەرگای وتووێژی جوانە، گفتوگۆکردنە بەجوانترین شێوە.

ئێمە فەرمانمان پێکراوە، فێری هەموو جۆرەکانی گفتوگۆبین، شێوازی وەرگرتنو وەڵامدانەوە، ئەلفوبێی گوێگرتن، وتەی جوانو هاوسەنگ. بۆ هیچ کەس نییە لە ئێمە، "هەرچەند پەیوەستیش بێت بەڕاستییەوە" زۆر لە خەڵك بکات هاوڕا بێت لەگەڵ بۆچوونەکانیدا، یان ئەگەر لەگەڵ بۆچوونەکانیدا نەبوو، ئەوا تۆمەتی ناڕەوای بدرێتە پاڵ.

ئێمە (هەڵگری بیروباوەڕین)، پێویستمان بەوەیە، وانەی یەکەم بەباشی ئەزبەر بکەین، کە ڕێگایەکە بۆچوونە ناو دڵانەوە؛ چونکە ئێمە بانگخوازین، نەك دادوەر.. هەڵگری مەشخەڵین، نەك جێبەجێکەری بڕیارەکان، ئێمە خاوەن ڕاو بەڵگەین، سینەتەنگ نین بە ڕای پێچەوانەو بەرهەڵستکارانمان.. ئەو کەسەی لە وتووێژ دەترسێت، لاوازە، سادەلۆحو شڵەژاوە.

بەڵام بەهێزەکان، هەمیشە لەپێشوازی بەیەکگەیشتی هزرەکاندان، پەرەکان ڕێك دەخەن، بیروباوەڕەکان دەگونجێنن، ڕوو بە متمانەو زەردەخەنەوە ڕووبەڕووی هەموو دنیا دەبنەوە.

هاوڕێ، تۆ لە هەموو کەس لەپێشتری بۆ ئەم ئەرکە، تۆ ئەولاتری، تا بەشێوەیەکی هۆشیارانە، لەسەرخۆو سەنگینانە، گفتوگۆ بکەیت، بیروڕاکان ئاڵوگۆڕ بکەیت.

هەموو ئەوکارانە، بەرپەرچ بدەرەوە کە کاری توندوتیژی بنیات دەنێتو دەبێت بەتۆقاندنی هزری، ئەگەر یەکێکیان ببێت بە دادوەر، ئەوا قەواڵەی بێتاوانی، یان بڕیاری ئیدانەکردنی دەردەکات.

# بەرگی بەردین!

ئەسکەندەر ڕەحیم

دەگێڕنـــەوە: لە دێر زەماندا، شـــایەکی بەهێزو دادپەروەر هەبووە، زیرەکیو ژیرییەکەی، بەناو شانشینەکەیدا دەنگی دابووەوە.. ئەم شایە، خۆشـــیی لە زیرەکـــەکان دەهاتو لەخۆی نزیـــك دەکردنەوەو تاووتوێی بابەتە فەلسـەفیو زانسـتیو دینیو گەردوونییەکانی لەگەڵدا دەکردن، تا مەلۆی زانیارییەکانی زۆرتر بکاتو هزروهۆشـــی دەمەزەرد بکاتەوەو خواردن بە ڕۆحی بدات.

لەم کـەشو هەوایەشـدا، زۆر ئاسـاییە، کە وەزیروگزیرو کەسـە نزیکەکانی شا، لە زیرەکەکان، یان لە زۆرزیرەکەکان بن. پاشا، زۆرجار خۆشـیی لەوە دەهات، وەزیروگزیرەکانی تاقـی بکاتەوەو زیرەکییان لە بێژنـــگ بدات، جارجارەش هێندە لە تاقیکردنەوەکاندا توندو ڕەق بوو، دەگەیشتە ئاستی ئەستەمو دەستەوسانی.

جارێکیان، پاشا ویستی وەزیرەکەی تاقی بکاتەوە، بانگی کردو پێی گوت: دەمەوێت لە بەرد جلوبەرگێکم بۆ بدووریت؟! بۆ ڕاپەڕاندنی ئەم کارە، سی ڕۆژت لە بەردەستدایە، گەر بۆت ئەنجام نەدرا، ئەوا سزایەکی سەخت چاوەڕێتە!

وەزیر، بە کۆڵێك خـــەمو پەژارەوە، گەڕایەوە بۆ ماڵ، چووە ژوورە تایبەتەکەی خۆیو دەرگای لەسەر خۆی داخستو بەدەگمەن نەبێت، لە ژوورەکـــەی نەدەهاتە دەرەوە. وەزیر لەبری ئەوەی بیری بەگەڕ بخاتو سـەرێك لەم داوا دەسەوسانکەرەی شا دەر بکات، کەچی دەستی کرد بە گریـانو گلەیی لە بەختی خۆیو خەوو خواردنو خواردنەوەی لەسـەر خۆی حەرام کرد.

کچی وەزیرەکە، هەسـتی بە باری نالەباری باوکی کرد، سـەری لە مانـەوەی باوکی لە ماڵو نەچوونی کۆڕی شـاهانە سـوڕما، چووە لای باوکیو پێی گوت: بابە گیان چیتە؟ بۆچی دڵتەنگو غەمباریت؟

وەزیـر وەڵامی دایەوە: مـن کە چەند ڕۆژێکی دیکـە، مۆڵەتەکەم تەواو دەبێت، چۆن دڵتەنگو غەمبار نەبم!

کیژەکەی بەسەرسـامییەوە گوتی: مۆڵەت! بابە گیان، تۆ باسـی چ مۆڵەتێك دەکەیت؟!

وەزیر گوتی: مۆڵەتێك کە پاشـا بۆی دیاری کردووم، تا خواستێکی ئەستەمی بۆ ڕابپەڕێنم.

کیژەکە گوتی: خواستێکی سەخت! بابەگیان، ئەو داواکاریو خواستە چییە؟

وەزیر گوتی: بیهێنە بەر چاوی خۆت.. داوام لێ بکرێت پۆشـاکێك لە بەرد بـدرووەمو بۆ ئەنجامدانی ئەو کارەش، سـی ڕۆژم لە بەردەستدا بێت!

کچەکـە بـە پێکەنینەوە گوتی: بابە گیان، پاشـا پۆشـاکی ناوێت، دەیەوێت زیرەکیی تۆ تاقی بکاتەوە!

وەزیر هەڵی دایە: پاشا پۆشاکی ناوێت! دەی کەواتە: چیی دەوێت؟!

کیژەکـە گوتـی: سـبەی، لەگەڵ خۆتـدا بمبە بۆ لای پاشـاو لەم گیرۆدەییو گرفتارییە ڕزگارت دەکەم!

پێشـینانمان گوتوویانە: ئەو کەسەی خەریکە دەخنکێت، پەلاماری چڵەپووشـیش دەدات، تـا ڕزگاری دەبێـت، لەبەرئـەوە وەزیـر، هیـچ چارەو دەرەتانێکی نەبوو، بە کیژەکەی خۆی گوت: سـبەی لە خزمەت جەنابی پاشادا، لەگەڵمدا دەبیت؛ بەشکو گومانەکەت بەڕاست بگەڕێتو سەرکەوتوو بیتو لەو سزایەی چاوەڕێمە، قوتارم بکەیت.

بۆ سبەی، وەزیرو کیژەکەی لەبەردەم پاشادا ئامادە بوون.

پاشا بە وەزیری گوت: دەبینم؛ بەر لە دواییهاتنی وادەو مۆڵەتەکە گەڕاویتەوە! ئاخۆ لەو کارەی لێم داوا کردبوویت، سەرکەوتوو بوویت؟!

وەزیـر وەڵامـی دایەوە: گـەورەم دەتوانیـت، ئـەو داخوازییە، لە کیژەکـەم بکەیـت، پەیمانی ئەوەی پێدام، کە لەجێـی من، ئەو ئەرکە جێبەجێ بکات.

پاشـا بزەیەکی کردو لە کیژەکەی پرسی: ئایا ئەو بەرگەت درووە، کە بە بابتم گوتووە؟

کیژەکە وەڵامی دایەوە: پاشا خۆش بێت، ئەو کارە زۆر دژوار نییە، بەڵام من دەمەوێت تەنها داوای یەك شتت لێ بکەم.. ئەویش ئەوەیە:

دەزووی لمینم پێ بدەیت، تا جوانترین بەرگی بەردینی سەر ڕووی دنیات بۆ بدرووم.

پاشـا، لـە ئاسـت وەڵامـی کیژەکە سـەری سـوڕما، خۆشـیی لە زیرەکییەکەی هات. بەدەنگی بەرز گوتی:

ئافەرین ئەی کیژی ژیر، تۆ زۆر زیرەکیت.. ئەوەی گوتت، وەڵامێکی ژیربێژییانـە بۆ داواکارییە ئەسـتەمەکەم.. پاشـان پاشـا ئاوڕێکی بە لای وەزیـردا دایەوەو گوتی: دەمێکە سـۆراغی کیژێکـی ژیر دەکەم، تا هاوسـەرگیری لەگەڵ کوڕە ژیرەکەمدا بکات، لەبەرئەوە خوازبێنی ئەو کیژە ژیرەت لێ دەکەم، بۆ کوڕە ژیرەکەم، جا نازانم جوابم دەدەیتەوە، یان جوابم دەکەیت؟

وەزیر گوتی: قوربان، زۆر بەخوشحاڵییەوە من ڕازیم، بەڵام دەبێت ڕای کیژەکەش وەربگرین، تا بزانین ڕای چییە؟

کیژەکەش، کە پێشتر ناوبانگی چاکیو زیرەکیی کوڕەشای بیستبوو، گوتی: جەنابی پاشـا، جا کێ ئەم داواکارییە جوانەی جەنابتان لەخۆی دەکات؟!

# خەمخۆری زیندووین، یان نانخۆری مردووین؟!

ئازاد محەممەد بەرگرکەیی

* دکتۆر عەلی شەریعەتی دەڵێت: دراوسێیەکم لە برساندا مرد، کەچی لە ڕێوڕەسمی پرسەکەیدا، مەڕێکیان بۆ سەربڕی. ئەم وتە بەنرخو پڕبەهایەی شەریعەتی، شتگەلێکی زۆر لەخۆ دەگرێتو فێری زۆر شتمان دەکات، بەداخەوە دەڵێم: ئێمە لە ڕۆژگارێکدا دەژین، شتەکان هەمووی پێچەوانەن، مرۆڤەکان هەموو ناخو سرووشتیان گومڕایە، میوەجاتەکان تامی ڕاستەقینەیان لەدەستداوە، شتەگرینگو پڕبەهاکان کاڵ بوونەتەوە، هێندەی گرینگی بەڕواڵەت دەدرێت، هیچ ئاوڕێك لە ناخ نادرێتەوە، توێکڵیش تەنها بۆ پاراستنی کاکڵە، هێندەی مامەڵە لەگەڵ ڕوخساردا دەکەین، نیو هێندە حسێب بۆ ڕوخسار ناکەین، هێندەی بۆ دونیا دەژین، هێندە هەوڵی ئاوەدانکردنەوەی دوارۆژ نادەین، وەستای قسانمان زۆرن، بەڵام کۆڵەواری دەستانن، ئەو ئنسانەی دەکرێن زۆربەیان قسەی زلی زەبەلاحی بریقەدارن، هیچیان لە مەیدانی کردارو پراکتیکدا جێبەجێ ناکرێن. هێندەی لەخەمی مردووین، هێندە لە خەمی زیندوودا نین، هێندەی بۆ خەڵكو مۆدێلو لەبەر خاتری ئەمو ئەو دەژین، ژیانی تایبەتیی خۆمان ون کردووە، هێندەی گرنگی بەشتەکانی دەوروبەرمان دەدەین، ناخی خۆمان فەرامۆش کردووە، خودا مرۆڤی تەکریمو ڕێزدار کردووە، بەزیندوویی‌و بەمردوویی، دەبێت ئێمەش ڕێزی تەواو لەیەکدی بنێین، وەکو گوتراوە: بەبوونمان خۆشحاڵ دەبن. شادومان دەبن، بەمردنیشمان نیگەرانو خەمبار دەبن، بەڵام لەم بەینەدا، هەستمان پێ ناکەن، ئێستا ڕێك وایە مەگەر ئاگامان لەبوونو مردنی یەکدی هەبێت، ئەگەرنا یەکدیمان بیر چووەتەوە، لە زیندوو پەستینو مردووپەرستین، هێندەی خەم بۆ مردوو دەخۆینو مەسرووفو ڕازاندنەوەی قەبرو چلەی ماتەمینی‌و ڕێورسمی تازیە بۆ مردوو دەکەین، با بە زیندوویی لەخزمەتی بینو دڵی نەڕەنجێنینو دژایەتی نەکەینو بەقەدەر پێویست یارمەتی بدەینو دڵخۆشی کەین، کە مرد خۆیو کردەوەی خۆی، بەڵام نەوەك چەندەها ساڵ لەسەر جێگا بکەوێتو پێویستی بەیارمەتی‌و هاوکاری ئێمە هەبێت، بەلایەوە نەچین، پاشان کە مرد، بۆ ڕیاو ڕووبینی سێ ڕۆژان لە پرسەی دابنیشین، شکسپیر دەڵێت: لەبری چەپکە گوڵێك بهێنیتە سەرگۆڕم؛ تا لەژیانم، یەك خونچەم پێشکەش بکە، زانایەکیش جوان دەڵێت: (تا هستم ای دوست، ندانی کیستم رزی به سریاغ من ای کەنیستم) واتە: (ئەی هاوڕێ تا لەژیاندام نازانیت کێم، بەڵام کاتێك بۆم دەگریت، کە لێرە نیم). **جارێکیان هەژارێك بە دەوڵەمەندێك دەڵێت ئەگەر من لەماڵەکەی تۆدا بمرم چیم لێ دەکەیت؟ دەوڵەمەندەکەش دەڵێت: ماچت دەکەم کفنت لەبەر دەکەمو ئەسپەردەی خاکت دەکەم، هەژارەکەش پێی دەڵێت: دەی ئەمڕۆ تا زیندووم کراسێکم لەبەر بکە، وەختێکیش کە مردم بەبێ کفن ئەسپەردەم بکە!**

موفتی پێنجوێنی زۆر جوانی پێکاوەو دەڵێت:

**پیاوی گەورەمان نایەتە بەردڵ**
**تاکو ئەو ڕۆژەی دەچێتە ژێر گڵ**
**ئینجا بۆی دەگرین بەجۆشو بەکوڵ**
**گۆڕەکەی دەکەین بەباخچەو بە گوڵ**
**بازێ کە بەربوو، لەدەستمان دەرچوو**
**بۆ مردوو نەگرین، بگرین بۆ زیندوو.**

خراپ حاڵی نەبن، من نامەوێت هەرگیزاو هەرگیز لەخێرو بایەخو بەهاو پاداشتی بەڕێکردنو ناشتنی مردوو کەم بکەمەوە؛ چونکە زۆرترین خێر لەوە دایەو یەکێکە لەو شەش مافانەی کە بەسەر یەکەوە هەمانە، بەڵام ئەوەی من گەرەکمە، ئەو هەموو ڕەسمیاتەو خەرجی‌و ڕۆتینیاتەو خۆ نمایشکردنەی پرسەیە، با بە هەموومان هەوڵ بدەین، پرسەکانمان بخەینەوە سەرچوارچێوە شەرعییەکەی.



# کیسەڵی خاوەن پەیام

**پێشەوا خالید ئەحمەد**

گرنگ نییە ڕەشـەبای ژیان لە کام ئاڕاستەوە هەڵدەکاتو لە کوێوە دێت، بەڵکو گرنگ ئەوەیە، تۆ لە سـەر ڕێگاو ئاڕاستەکەی خـۆت بـەردەوام بیـت. هاتنـە دنیای ئێمـە. پەیـامو ئامانجی دیاریکـراوی خۆی هەیە، ئەویش ئاوەدانکردنەوەی سـەر زەویو جیهانـە، بۆیە پێویسـتە لەسـەر هەر تاکێك، سـەر زەوی بەبێ هـوودەو بەبێ مەبەسـت نەژی، چیدی سـەرمان ڕوو لە زەویو چاومان ڕوو لە دوێنێ نەبێت، با سـەر بەرز بکەینەوەو چاومان لە ئاسۆو داهاتوو بێت؛ بۆئەوەی تواناکانمان بخەینە گەڕ بەرەو ژیانێکی خۆشترو بەختەوەرتر، زۆرێك لە ئێمە کارتۆنی کیسەڵو کەروێشـکەکەمان بینیوە، بەڵام لە پشـت ئەمەوە، فەلسەفەیەکی گرنگ هەیە کە پێمان دەڵێت:

١- تۆ تواناو وزەی شاراوەو زۆرت هەیە، بەڵام نەتدۆزیوەتەوە، یـان بـەکارت نەهێناوە، ئەگەر پـلانو ئامانجێکـی دیاریکراوت هەبێـت، ئـەوا دەتوانیت کاری زۆر گەورە بکەیـت، کە لەوانەیە خۆشـت بیرت لـێ نەکردبێتەوەو گەر بـۆ دەوروبەرەکەتی باس بکەیت، پێکەنینیان بێت، ئەگەر بە هەر کەسـێك بڵێیت: ئەگەر کەروێشـكو کیسـەڵ پێشـبڕکێ بکەن، کامیـان دەیبەنەوە؟ بە پێکەنینەوە دەڵێت: (بێگومان کەروێشك)، بەڵام باوەڕبەخۆبوونو کۆڵنـەدانو دۆزینـەوەی توانا شـاراوەکانی خـۆت، دەبێتە هۆی درووسـتکردنی موعجیزە، وەك چۆن کیسـەڵەکە پێشـبڕکێکەی بردەوە.

٢-مرۆڤی سـەرکەوتوو، بیر لە ڕابـردوو ناکاتەوەو هەردەم بـۆ ڕووی ئامانـجو سـەرکەوتن دەڕوانێت، کیسـەڵەکە فێرمان دەکاتو دەڵێـت: (ژیان وەکو پێشـبڕکێی ماراسـۆن وایە، نابێت ئاوڕ بدەیتەوە؛ چونکە ئەگەر ببینیت، کە مونافیسـەکەت دوورە، ئەوا تۆش خـاو دەبیتەوەو دەڵێیت پەلەم نییە، نابێت سـەیری بەردەمی خۆت بکەیت؛ چونکە ماندووت دەکاتو خاوت دەکاتەوە، بۆیە پێویسـتە هەمیشـە ڕووت لە ئاینـدەو ئامانجەکەت بێت؛ بۆئەوەی هەمیشە بە هەمان نەفەسو وزەی سەرەتاوە، لە هەوڵو تێکۆشانو بەردەوامیدا بیت.

٣-زۆرجار پێویسـتە شەوو ڕۆژ بکەیت بە یەکو ئیسراحەتو کارە لاوەکـیو فەراهیاتەکانـی ژیان وەلا بنێیـت، هەموو ڕێگەو توانایەکی خۆت بەکار بهێنیت، کیسەڵەکە پێمان دەڵێت: (ڕێگاکە زۆر بـوو، منیش خاوم؛ بۆئەوەی یەکەم بم، دەبێت ئیسـراحەت نەکـەمو بەردەوام بـم، لە کۆتاییدا خەریك بوو کەروێشـك لێم بباتەوە، بەڵام من ملم درێژ کرد)، سـەیرکە بەوەوە نەوەستا، کە ئیسراحەتی نەکردو بەردەوام بوو، بەڵکو هەموو تواناو لێهاتوویی‌و وزەیەکی خۆی سەرف کرد؛ بۆئەوەی سەرکەوتوو بێت.

ئازیزان، تـۆ خاوەنی کۆمەڵێك تواناو بەهـرەو لێهاتووییت، کـە لەگەڵ کەسـەکانی دیکەدا جیـات دەکاتەوە، بەڵام پێوسـتە بیاندۆزیتـەوە، باشـە لە خۆتت نەپرسـی: چۆن ئەم کیسـەڵە، ئەم کڵاوەی خسـتە سەر پشـتی؟ خۆ ئەگەر بکەوێتە سەر پشت، ناتوانێت هەڵبگەڕێتەوە؟ نەتپرسـی: باشـە بۆ بەم بارانو تۆفە دەڕواتو لە ڕێگەدایە؟

ئەم کیسـەڵە کڵاوەکـەی لە ناو دەریاکـەدا بینیوەو چووەتە ناو ئاوەکەوەو کڵاوەکە چۆتە سـەر پشـتیو وردە وردە هاتووەتە دەرەوە، لێرە لێهاتوویی بەکارهێناوە، لەسـەروو ئەوەشەوە پێمان دەڵێت: (شتێك لە ژیاندا بوونی نییە، کە نەتوانیت بیکەیت، بۆیە هەرگیز مەڵێ ناتوانیت)؛ چونکە وەك خودای گەورە دەفەرموێت: **(و أن ليس للانسان الا ما سعى).**

بەم کـەشو هەواو بـارانو تۆفانە، ئەم هەر بـە ڕێگاوەیەو نەوەستاوە، لە کاتێکدا چەندین کیسەڵی دیکە لە ژێر دارو بەردا، خۆیـان شـاردووەتەوە؛ بۆئەوەی باران لێیـان نەدات، بەڵام ئەم کیسـەڵە پێمان دەڵێت: (ئەگەر دەتەوێت سـەرکەوتوو بیتو بە ئامانجەکـەت بگەیت، دەبێت کۆڵ نەدەیتو بەردەوام بیت)، هەر چەندە ڕێگرو کێشـە هەبێت، بەڵام پێویستە تۆ باوەڕت بە خۆت هەبێتو سـەر بەرز بکەیتەوەو هەمیشە ڕووت لە خاڵی کۆتایی‌و بەدەسـتهێنانی ئامانجەکـەت بێـت، گوێ بۆ دەوروبـەر مەگرە؛ چونکە کەسانێك هەن، کە ئیهمالو خاوت دەکەنەوە.

ڕاسـتە کیسـەڵ قاوغێکی ڕەقی هەیەو لەشـی تـەڕ نابێت، بـەڵام ئـەم پلانی بۆ ئەوە داناوە کاتێك بە ڕێگادا دەڕوات سـەر دەر دەهێنێـتو تـەڕ دەبێت، بۆیە ئەم کڵاوەی کردووەتە سـەر پشـتی، بۆیە پێویستە لە ژیاندا پلان بۆ سات بە ساتی دابنێیت؛ بۆئەوەی تا خاڵی کۆتایی‌و بەدەسـتهێنانی ئامانجەکەت بەردەوام بیتو کۆڵ نەدەیت.

لە کۆتاییدا، هەرچەندە ژیان سـەختو ناڕەحەت بێت، بەڵام بـە ویسـتو ئیـرادەو باوەڕبەخۆبوونی مرۆڤو پـلان بۆ ژیان، کۆڵنەدانو بەردەوامی، سەرەنجام بە ئامانج دەگەیت.



# لیۆناردۆ داڤینشی

## (١٥١٩-١٤٥٢)

ئالانی

یەکێکە لـە بەناوبانگترین وێنەکێشو ئەندازیارو ڕوەکناسو جوگرافیناسو زاناکانی ئیتالیا.

**لیۆناردۆ داڤینشی کێیە؟**

لیۆناردۆ لە ١٤٥٢\٤\١٥ لە ڤینس کە شارێکی بچووکە لە ئیتالیا لەدایکبووە، دایکی ناوی کاترینا بووە، باوکیشی پارێزەر بووە، کە ناوی پیرۆ داڤینشی بووە، داڤینچش واتە: خەڵکی ڤینیس.

لیۆنـــاردۆ یەکەمیـــن کـەس بـــووە، لـە نێـو هونەرمەندو وێنەکێشـــاندا، کە ویســـتویەتی لـــە ڕێی کارەکانییـــەوە لەجوانی سرووشتی گەردوون بکۆڵێتەوەو پێناسەی بکاتو نیشانی بدات.

بیرۆکەکانـــی لیۆناردۆ، زۆر بەهێز بوون. ئامانجی ئەوە بووە کـــە تێگەیشـــتنەکانی لە سرووشـــت بەکار بهێنێت بـــۆ داهێنانو دروســـتکردنی چەندیـــن ئامێر؛ بـــۆ باشـــتر بەڕێوەبردنی ئەو جیهانەی تێیدا دەژیا.

لێۆناردۆ لەســـەردەمی خۆیدا، وەك هونەرمەندێك، هەروەها وەك داهێنەرێك، زۆر ڕێزی لێدەگیرا.

لێۆناردۆ بەردەوام ســـەیری سرووشـــتی دەكـــردو زۆر بیری دەكردەوە؛ بۆئەوەی باشتر لەم گەردونە تێبگات.

ژمارەیەكـــی زۆر بەڵگەنامە، لەســـەر ژیانـــی لیۆناردۆ هەیە، هەروەهـــا بەهـــۆی نووسینەكانیشـــیەوە، لـــە كۆتاییەكانی ١٥٢٠دا پاوڵۆجیڤـــۆ، تـــا ڕادەیەك دەیزانـــی كە لیۆناردۆ لـــە میلان، یان ڕۆمایە، ســـەبارەت بـــە لێۆناردۆ وتوویەتی: كەســـێكی زۆرجوانو بەڕەوشتو بەخشـــندە بووەو هەمیشە بە خەندەو دڵی خۆشەوە قســـەی بۆ بەرامبەر كردووە، نووسەرێكی دیكەش هەر سەبارەت بە لێۆناردۆ وتوویەتی: كەسێكی زۆر سەرنجڕاكێش بووەو ڤژێكی جوانی هەبووە. دەشڵێت: ئاسایی چاكەتێكی پەمەیی كورتی لەبەر دەكرد، كە لەو كاتەدا باوی چاكەتی درێژ بووە.

لە ساڵی ١٥٥٠ نووسەرێكی دیكە (جۆرجیۆ ڤاساری) نووسیویەتی كە لیۆناردۆ زۆر بە هێز بووەو حەزی لە ئەسپسواریو سوارچاكی كردووە.

لیۆنـــاردۆ بـــۆ ئەو كاتە ئاســـایی نەبـــووە؛ چونكە گۆشـــتی نەدەخـــواردو ڕووەكی بووە، بـــەڵام نەزانراوە، تا كۆتایی ژیانی وا بووە، یان نا.

لیۆناردۆ، لە دەوروبەری ١٤٨٣، لەبارەی خۆیەوە، لە نامەیەكدا بۆ لیۆدیڤیكۆی نووســـیوە؛ لە كاتی ئاشـــتیدا بڕوام وایە دەتوانم دڵخـــۆش بـــم، هەروەكو تەواوی كەســـانی دیكـــە، دەتوانم پلانی نەخشەی بیناسازی دابنێم بۆ تەلاری تایبەتیو گشتیش، هەروەها گوێزانەوەی ئاو لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی دیكە، دروستكردنی پەیكـــەر لە مەڕمـــەڕ، برۆنزو ڤوڕ، لە وێنە كێشانیشـــدا دەتوانم هەموو شتێك بكەم، بەوانەشەوە كە دەڵێن مەحاڵە..

لـــە ١٤٩٠دا، نـــاوی چـــووە یەكێك لـــە چـــوار ئەندازیارەكەی لیۆدیڤۆوە.

* لیۆناردۆ زۆر بایەخی بە ئاو دەداو حەزی لێ بوو هەر لە بچووكترین دڵۆپەوە، تا جۆگەو ڕووبارە گەورەكانو دەریاكانیش. بە لایەنی كەمەوە دوو لەو كتێبانەی كە تێبینی تێدا نووســـیوە لەبارەی ئاوەوەیە.

كۆدێكس لیسێســـتێر، كە ئێستا وای پێ دەڵێن لە دەوروبەری ١٥٠٧و ١٥١٠ نووســـیویەتی، هەمـــووی لەبـــارەی شـــێوەكانو هاتنە خوارەوەی ئاوەوەیە.

لـــە میلان لە مانگی ٩ بۆ ١٠ی ١٥٠٨ لیۆناردۆ كتێبێكی دیكەی پـــڕ كردەوە لە تێبینیەكانی لە ژێر ناونیشـــانی گەردوون لەگەڵ ئاو.

لیۆنـــاردۆ ویســـتی ئەم خوێندنانـــەی بە دوو ڕێگـــە بە كار بهێنێـــت، یەكەم بۆ وێنەكردنی خـــۆی، دووەم بۆ كۆنترۆڵكردنی جووڵەی ئاو لەگەڵ دروستكردنی ئامێرێكدا كە ئاو بڕژێنێت.

ئەو تەنها هەوڵی كێشـــانی ڕوبارو دەریاكانـــی نەدەدا، بەڵكو

کێشانی ئەو ڕێگەی کە چۆن ئاو لە هەوادا ڕەنگی ئاسمان دەگۆڕێت، چۆنێتیی بینینی تۆ، بۆ ئەو ماوە دوورە، باسی چۆنێتیی ئەو زریانو ڕەشەبایە دەکات، کە لە ڕوباری ئارنۆدا بینیویەتی، ڕەشەباکە دەگەڕێتەوەو بەر ئاوەکە دەکەوێتو بەرزی دەکاتەوەو چاڵێکی گەورە درووست دەکات، ئاوەکە بەرێکی بۆ ناو هەواکە بەرز دەبێتەوە، ڕەنگی هەروەکو ڕەنگی هەورەکانە، ئەمانەم بینی لەسەر لمی ڕوبارەکە، لمەکە چاڵ ببوو زیاتر لە بەرزی باڵای مرۆڤێك.

لەو زیخو چەوەکان هەڵدەدران بە دەوری ئەو ناوچە فراوانەدا، لە هەواکەدا وا دەردەکەوێت کە تەلارێکی بەرز بێتو بەشی سەرەوەی بڵاو بووبێتەوە وەك لقەکانی درەختێکی بەرز.

وێنەکانی دواتری لیۆناردۆ، ژمارەیەکی زۆر ڕەشەبا پیشان دەدەن، لیۆناردۆ نووسیویەتی؛ جووڵەی هەواو تووڕەییەکەیم بینی، کە درەختی گەورەی دارستانەکانو سەقفی خانووەکان چۆن دەبات بە ئاسماندا، هەمان تووڕەیی چاڵی گەورە درووست دەکاتو بەردەکان لا دەبات.

**وێنەکێش لیۆناردۆ:-**

لیۆناردۆ پێی وا بوو وێنەکێش دەبێت چیرۆکێك بگێڕێتەوە، زۆر خێراترو ئاسانتر لە نووسەر، ئەویش بە نیشاندانی ئەوەی چۆن شتەکان بە تەواوی دەردەکەون. مۆنالیزاکەی لیۆناردۆ، یان لاگیۆکۆندا، ئەمرۆ تا ڕادەیەك بەناوبانگترین وێنەیە لە جیهاندا. ئەو دەڵێت وێنەکێشان، بیرکردنەوەیە، پێکهاتووە لە ئاڵۆزی زۆر.

ناوی مۆنالیزا لە ١٥٥٠ دا دەرکەوت سەرەتا، کاتێك جۆرجیۆ ڤاساری لەبارەی ژیانی لیۆناردۆ نووسیویەتی، لە کتێبێکدا کە باسی ژیانو کاری هونەرمەندی ئیتاڵی دەکرد.

ڤاساری دەڵێت: لە فلۆرێنس لیۆناردۆ دەستی کرد بە وێنەکێشانی لیزا گێرادینی، کە ژنی فرانسیسکۆ دێل گیۆکۆندابوو، مۆنا کورتکراوەی مادۆنایە، واتە خانمەکەم، بە ئیتاڵی، بە شێوەی ڕێز، بۆ ئافرەت بەکار دێت.

مۆنالیزا واتە لیزا خانم، ناوەکەی دیکە بۆ وێنەکێش لاگیۆکۆندا دوو مانای دەبێت؛ خانم دێل گیۆکۆندا، یان دڵخۆش واتە: خانمی دڵخۆش.

**ئەندازیارو دیزاینەر**

لە دەوروبەری ١٤٨٣دا، لیۆناردۆ نامەیەکی بۆ لیۆدۆڤیکۆ سفۆرزا لە میلان نووسی بۆئەوەی پێی بڵێ کە دەتوانێ چی بکاتو بۆچی لیۆدۆڤیکۆ دەبێت دایبمەزرێنێت. وتی؛ چەندم بینیوە بیرم کردۆتەوە لە کارەکانی خەڵکی، ئەوانەی کە خۆیان بە باشترین درووستکەری ئامێری شەڕ دادەنا. من بیرۆکەکانو نهێنییەکانی خۆمت پیشان دەدەمو پاشان دەتکات بەوەی کە خۆت دەتەوێت. پاشان هەندێك لە بۆچوونەکانی کرد بە لیستێك بۆ جبەخانەی سەربازی، سووکەڵە بوون، بەڵام بەهێزو پردی جووڵاوبوون ڕێگایەك بوون بۆ وێرانکردنی پردەکانی دوژمن، پەیژەو پرد بۆ سەربازگە، ڕێگا بۆ وەستانی هاتنە دەرەوەی ئاو لە چاڵەکانی کە هەڵکەندراون، ڕێگا بۆ ڕووخانی قەڵا بەبێ بەکارهێنانی چەکی گەورە. چەکی جووڵاو کە دەیتوانی لە ژمارەیەکی زۆر بەرد بدات، ڕێگای نهێنی، ژێر زەوی و ژێر ڕوبارەکانیش کە تەنانەت ئەو لۆریانەشی داپۆشیوە، بۆئەوەی بتوانن بە دڵنیاییانە برۆن بە ناو سەربازە دوژمنەکاندا، چەکی بچووك گەورەو نائاسایی و مەکینە بۆ هەڵدانی بەردو کەشتی کە ئەمین بوو لە هێرشی چەك لە دەریا.

*** فەرەنسا:**

لە هاوینی ساڵی ١٥١٦ میوانداریییەکەی فەرەنسییەکانی قبووڵ کردو ڕۆیشت بۆ کۆشکی سەرۆك فرانکۆیس لە ئەمبۆیس لە شێوی لۆریی، لیۆناردۆ لەلایەن فەرەنسییەکانەوە ڕێزی زۆری لێدەگیراو خەڵاتی زۆریان دەکرد.

ناونیشانی سەرکردەی وێنەکێشەکانیان پێ دابوو، هەروەها خانوویەکی گەورەیان لە کلۆس لویس لە قەراغ ئەمبۆس پێبەخشی.

لە مانگی ١٠ی ١٥١٧ دا نووسراوە، کە لیۆناردۆ لاواز بووە لە گرتنی قەڵەم، لەبەرئەوە نەیدەتوانی بەئاسانی وێنە بکێشێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، وێنەی دەکردو وانەی دەوتەوە.

لیۆناردۆ هەموو شتەکانی، وێنەکانی، جلەکانی لە فەرەنسا بۆ فرانسیسکۆ بەجێ هێشت، نیوەی باخەکەی لە قەراغ میلان بەخشی بە خزمەتکارەکەی، نیوەکەی دیکەیشی بەخشی بە سالایی.

هەموو ناو ماڵەکەی لە کلۆس لوسێ لەگەڵ پارەکانی کۆکرایەوە لەلایەن کەشتیوانەکانەوە، ترخانکرا بۆ درووستکردنی کەناڵێکی ئاو بۆ گواستنەوەی کەشتی لە میلان.

لە نامەکەی میلزیەوە زانیمان کە کێڵگەیەکیشی لە فیسوڵی لە باکوری فلۆرەنس وەرگرتووە.

لیۆناردۆ لە ماڵەکەی خۆیدا، لە کلۆس لیۆس لە دوو شەممە ١٥١٩/٥/٢ کۆچی دوایی کرد.

ئێستا نزیکەی ٥٠٠ ساڵ بەسەر مردنیدا تێپەڕیوە، بەڵام بۆچی تا ئێستا ناسراوە؟

١٠ ڕۆژ پێش ئەوەی بمرێت، نووسیویەتی کە حەز دەکات پاش مردنی، چی لە سامانەکەی بکرێت.

**چەند زانیارییەکی سەرنجڕاکێش سەبارەت بە لیۆناردۆ داڤینشی:**

* داڤینشی توانیویەتی لەیەك کاتدا بەدەستێکی بنووسێتو بەدەستەکەی دیکەیشی وێنە بکێشێت.

* بۆ یەکەمین جار لەساڵی ١٥٠٨دا، هاوێنەی چاو لەلایەن داڤینشییەوە پێشنیاز کراوە.

* بەگوێرەی بەرنامەیەکی تایبەت بە ناسینی دەموچاو، ڕوخساری دەموچاوی مۆنالیزا کە بەناوبانگترین تابلۆی ئەم ناودارەیە، لەسەدا ٨٣ی خۆشحاڵەو لەسەدا نۆی بێتاقەتەو لەسەدا شەستی ترسەو لەسەدا دووەکەی دیکەیشی تووڕەیە.

* هەروەك ناپلیۆن، مایکڵ ئەنجیلۆ، ئەنیشتاین، نیوتن، بیڵ گەیتس، ئۆپرا، ئۆباما، لیۆناردۆ داڤینشیش چەپلەر بووە.

* ئەم ناودارە واڕاهاتبوو کە زیندەوەری لەقەفەزنراوی لەبازاڕ دەکڕیو ئازادی دەکردن.

# پیسبوونی هەوا

جەلال عەبدوڵا حاجی

(بەشی یەکەم)

زەوی بە چینێك لە هەوا دەورە دراوە كە (لە تێكەڵە گازێكی جۆراو جۆر پێكدێت)، پێی دەوترێت ئەتمۆسفێر، ئەتمۆسفێر زەوی دەپارێزێتو ڕێگە بە بەردەوام بوونی ژیان دەدات لەسەری، ئەگەر ئەم چینە نەبووایە، تینی گەرمی خۆر لە ڕۆژدا دەیسوتاندین، یان بەهۆی دابەزینی پلەی گەرمیەوە لە شەودا دەمان بەست.

**پیسبوونی هەوا كەی ڕوودەدات؟**

پیسبوونی هەوا ڕوودەدات ئەگەر گازەكان، دووكەڵ، بۆنوبەرامە، تەپوتۆز بكرێتە هەواوە (ئەتمۆسفێر)، هەوا ناخاوێن دەبێت، بەجۆرێك دەبێتە هۆی زیانگەیاندن بە مرۆڤ، گیانلەبەرانو ڕووەك.

هەر مادەیەك كە دەكرێتە هەواوە گاز بێت، تەنۆلكە، یان بۆنوبەرامە (سرووشتی بێت، یان لە ئەنجامی چالاكی مرۆڤەوە بێت)، ئەگەر ئەم هاوسەنگیە سرووشتیە تێك بدات، زیان بەڕووەكو گیانلەبەران بگەیەنێت، پێی دەوترێت پیسبوونی هەوا.

**ئەو شتانەی كە دەبنە هۆی پیسبوونی هەوا پێیان دەوترێت:**

پیسكەرەكان، وەك ئۆكسیدەكانی نایترۆجین، یەكەم ئۆكسیدی كاربۆن، هایدرۆكاربۆنەكان، ئۆكسیدەكانی گۆگرد (بەزۆری لە كارگەكانەوە دەردەچێت)، تەپوتۆزو تەنۆلكەی ورد،لەگەڵ مادده ئەندامیەكان كە توانای هەڵمینیان هەیەو دەچنە هەواوە.

**مادە پیسكەرەكانیش دوو جۆرن:**

یەكەم: پیسكەرە یەكەمییەكان: ئەو گازو تەنۆلكانە دەگرێتەوە كە ڕاستەوخۆ دەكرێنە هەواوە، دەبنە هۆی پیسبوونی هەوا، وەك گازی یەكەم ئۆكسیدی كاربۆن لە ئەگزۆزی ئۆتۆمبێلەكانەوە، یان گازی دووەم ئۆكسیدی گۆگرد لە ئەنجامی سووتانی خەڵوزەوە.

دووەم: پیسكەرە دووەمییەكان: كاتێك پیسكەرەكان لە هەوادا تێكەڵ دەبن، لەگەڵ یەك كارلێك دەكەن، ماددەی كیمیایی مەترسیدارتر دروست دەبێت، بە بوونی تیشكی خۆر تەمە دووكەڵ (smog) دروست دەبێت، كە هۆكاری زۆر نەخۆشیە.

ئەم مادده كیمیاییانە كاریگەریان هەیە لەسەر تەندرووستی مرۆڤ، كێشەی هەناسەدان دروست دەكەن، دەبنە هۆی سوتانەوەی چاوو لوت، هەروەها كاریگەریان هەیە لەسەر كۆ ئەندامی دەمار، ئەگەر هەڵی بمژین، تەنانەت هۆكارە بۆ شێرپەنجە. كاتێك پیسبوون لە هەوادا ڕوودەدات، زۆر بەئاسانی بڵاودەبێتەوە، لەبەرئەوەی ئێمە هەوا هەڵدەمژین، بەئاسانی ناتوانین ڕێگری لێ بكەین.

**چی دەبێتە هۆی پیس بوونی هەوا؟**

پیسبوونی هەوا لە ئەنجامی چالاكی مرۆڤو سرووشتەوە دێت، ڕووداوە سرووشتیەكان كە دەبنە هۆی پیسبوونی هەوا، وەك سوتانی دارستانەكان، تەقینەوەی بوركانەكان، ڕماڵینی با، بەهەڵمبونی مادە ئەندامیەكانو تیشكە چالاكی سرووشتی.

**ئەو چالاكیانەی مرۆڤ كە دەبنە هۆی پیسبوونی هەوا وەك:**

١. ئەو گازانەی كە لە كارگەكانەوە دەردەچن:

كاتێك سەیری كارگەكان دەكەیت، لولەی ئەستور دەبینیت بەرەو ئاسمان بەرز بوونەتەوە، دوكەڵو هەڵمێكی زۆری لێوە دەردەچێت، وەك كارگەی سوتانی خۆڵو خاشاك، كارگە پیشەسازییەكان، وێستگەی بەرهەمهێنانی كارەبا، لە دوكەڵەكەیاندا ڕێژەیەكی زۆر لە یەكەم ئۆكسیدی كاربۆن، ئاوێتە ئەندامیەكانو ماددەی كیمیایی تێدایە، ئەمە بەبەردەوامی لەو شوێنانە ڕوودەدات كە مرۆڤی لێ دەژی. هەروەها كارگەی پاڵاوتنی نەوت ڕێژەیەكی زۆر مادەی هایدرۆكاربۆنی دەكاتە هەواوە.

٢. سوتاندنی نەوتو بەرهەمەكانی: لە دوای سەردەمی پیشەسازییەوە، هۆیەكانی گواستنەوە بوون بە بەشێكی سەرەكی لە ژیانی ئێمە، ئۆتۆمبێلی بچوكو بارهەڵگرەكان، شەمەندەفەر، كەشتیو فڕۆكە ، هەموویان بڕێكی زۆر سوتەمەنی بەكاردەهێنن، ئەو گازانەشی كە دەردەچن بڕێكی زۆر لە پیسكەرە یەكەمیو دووەمیەكانیان تێدایە، ئەمە هۆكاری سەرەكی پیسبوونی هەوایە، كە بەئاسانی ناتوانرێت چارەسەر بكرێت، چونكە مرۆڤ پێویستی بە بارهەڵگرو هۆیەكانی گواستنەوە هەیە بۆ گواستنەوەی خەڵكی، كەرەستەو پێشكەشكردنی خزمەتگوزاری.

٣. مادە كیمیایەكانیماڵەوەو كێڵگە:

مادە پاككەرەوەكانی ماڵەوە، دوكەڵی مەتبەخ، ڕەنگو بۆیە، فڕكەری مێرو، پەینی كیمیایی، هەموویان مادەی كیمیایی زیانبەخش دەكەنە هەواوە، كە دەبنە هۆی پیسبوونی هەوا، زۆرجار ئەم مادە كیمیاییانە بەكاردەهێنین، لە ماڵەوە، یان لە شوێنی ئیش، لەبەر نەبوونی، یان كەمی هەوا گۆڕكێ، ڕەنگە نەخۆش بكەوین ئەگەر لێی هەڵبمژین.

سەرچاوە: /http://www.eschooltoday.com



# شێخ ئەحمەد دیدات

## ١٩١٨ – ٢٠٠٥



بەرزان ئەبوبەکر

لە هەر شوێنێك، باسی بانگخوازانی سەردەم بکرێت، ئەوا دیدات پێشەنگەو لە ڕیزی پێشەوەی بانگخوازانە.. لە هەر کلۆجێك، باس لە کاریگەریی بانگخوازان بکرێت، دیدات لە ڕیزبەندیی یەکەمەکانی ئەو کاروانەدایە، دیدات ئەو مرۆڤەی ڕووناکی پەیامی خودای بە ملیۆنان مرۆڤ گەیاند، ئەو بانگخوازەی بووە هۆی ڕزگارکردنی ملیۆنان مرۆڤ؛ لە تاریکایی ستەمو زۆرداری..

نووسینەوەی ژیاننامەی شێخ ئەحمەد دیدات، تەنها بە وتارێك، یاخود تەنها بە چەند پەڕەیەك، نەك باس ناکرێت، بەڵکو بە چەندین کتێبی قەبارە گەورەو کۆگایەك لە کتێبخانەکان ژیانی ئەو بانگخوازە نانووسرێتەوە؛ چونکە نووسینەوەی ژیاننامەی ئەو بانگخوازە، پەڕاوەکان بە وێنەی گوڵ بۆنخۆش دەکات، تاریکییەکان بە وێنەی مانگ ڕووناك دەکاتەوە، دیدات تەمەنێك لێوانلێو لە خزمەتو لێبوردەییو لێبڕانو گیانفیدایی بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی.. دیدات ئەو کەسەی هاوشێوەی مۆم دەتوایەوە؛ بۆئەوەی دەوروبەرەکەی ڕووناك بکاتەوە، بێئەوەی گوێ بداتە ماندووبوونو سەختی ڕێگەو کۆسپو هەورازو نشێوییەکانی بەردەمی.

ژیاننامەی شێخ دیدات، چرایەکی ڕاستەقینەیە، بۆ هەموو ئەو کەسانەی لە خەمی گەیاندنی پەیامی خودای گەورەدان، یان هەر کەسێك هیواو ئاواتی کارکردن بێت لەو ڕێگەیەدا.. گەر تا ئێستا ئەم زانایەت نەناسیوە، بفەرموو با پێکەوە چەند دێڕێك لەسەر ژیانی ئەم زانا پایەبەرزە بخوێنینەوە..

شێخ ئەحمەد دیدات، لە ساڵی ١٩١٨ لە شارۆچکەی تادکیشنار لە ویلایەتی سوراتی هیند، چاوی بە دونیا هەڵهێناوە..

* لە تەمەنی نۆ ساڵیدا، چووە بۆ لای باوکی، لە باشووری ئەفریقا..

* لە تەمەنی دە ساڵاندا دەستی بە خوێندن کردووە؛ تا ئەو کاتەی پۆلی شەشی سەرەتایی تەواو کردووە، دواتر لەبەر نەبوونیو کەمدەرامەتی دەستی لە خوێندن هەڵگرتووە.. لە تەمەنی شانزە ساڵیدا، لە ساڵی ١٩٣٤ بووەتە شاگردی دوکانی فرۆشتنی کەلوپەلی خواردەمەنی، پاشان بووەتە شۆفێر لە کارگەیەك، کە تایبەت بوو بە فرۆشتنی کەلوپەلی ناوماڵ، پاشان لە هەمان کارگەدا، بووەتە نووسەری کارگەکەو حساباتی کارگەی کردووە، دواتر لەبەر لێهاتوویيو دەسترەنگینی، کراوە بە بەڕێوەبەری کارگەکە.

* لە کۆتایی چلەکاندا، پەیوەندیی کردووە بە خولی ڕاهێنانی سەرەتایی بۆ چاککردنەوەی ڕادیۆو دانانی ئەندازەی کارەباو (کارەبابەستن)و چەندین لایەنی هونەری دیکە، لەو ڕێگەیەوە توانی سامانێکی باش کۆ بکاتەوە، پاشان لە ساڵی ١٩٤٩ کۆچ دەکات بۆ پاکستانو ماوەیەك لەوێ دەمێنێتەوە؛ تا ئەو کاتەی کارگەیەکی ڕستنو چنین دادەمەزرێنێت.

* دواتر ژیانی هاوسەری پێك دەهێنێتو خودای گەورە دوو کوڕو کچێکی پێ دەبەخشێت.

* دوای بەسەربردنی چەند ساڵێك ژیان لە پاکستان، ناچار دەبێت کە بگەڕێتەوە بۆ باشووری ئەفریقیا؛ بۆئەوەی ڕەگەزنامەی ئەفریقی لەدەست نەدات؛ چونکە ئەو لەدایکبووی باشووری ئەفریقا نییەو بە ڕەگەز هندییە.

بە گەیشتنی بۆ باشووری ئەفریقیا، دەستبەجێ پلەی بەڕێوەبەری لە هەمان کارگەی کەلوپەلی ناوماڵ، کە پێشتر تێیدا بەڕێوەبەر بوو، پێبەخشرا، واتە: بووەوە بە بەڕێوەبەر لە هەمان کارگەدا.

* لە سەرەتای پەنجاکاندا، یەکەم کتێبی نووسی بە ناونیشانی (کتێبی پیرۆز سەبارەت بە پێغەمبەر محمد (سەلامی خودای لێ بێت)چی دەڵێت؟)، دوای ئەوە کتێبی دووەمی بەناونیشانی (ئایا کتێبی پیرۆز کەلامی خودای گەورەیە؟) نووسی.

* ساڵی ١٩٥٩ شێخ ئەحمەد دیدات، وازی لەسەرجەم کاروکاسبیو کارکردنێك هێنا؛ بۆئەوەی خۆی تەرخان بکات، بۆ ئەو کارە گرنگەی کە بڕیاری دابوو، لەمەودوا ئەو تەمەنەی کە ماویەتی لەو پێناوەدا بەسەری ببات، کە بریتی بوو لە بانگەواز بۆ دینی خوداو ڕێنمایی خەڵکی بۆ ڕێبازی ڕاستەقینەو بەختەوەریو هەمیشەیی، لە ڕێگەی کۆڕبەستنو گفتوگۆو ڕووبەڕووبوونەوەی کەسانی بێباوەڕو مەسیحیو..هتد، لە درێژەی هەوڵەکانیدا بۆ

گەیاندنی پەیامەکەی، سەردانی چەندین دەوڵەتی کردووە، شێخ دیدات لە ڕێگەی مونازەرەو کۆڕەکانییەوە، لەگەڵ گەورە پیاوانی مەسیحیدا، وەکو (کلارك، جیمی سواگارت، ئەنیس شروش) دانیشتووەو لەو ڕێگەیەوە ناوبانگی زۆری دەرکردووە.

* شێخ دیدات، پەیمانگەی ئاشتی بۆ پێگەیاندنو دەرچوونی بانگخوزان، کە ناوەندێکی نێودەوڵەتی بوو، بۆ بانگەوازی ئیسلامی، لە شاری دیربان، لە باشووری ئەفریقیا دامەزراند.

* شێخ دیدات زیاتر لە بیست کتێبی داناوە، ملیۆنان دانە لە کتێبەکانی چاپکراونو بێبەرامبەر بڵاوکراونەتەوە، ئەوە جگە لە کۆڕو سیمینارەکانی، کە لە دوای خۆی بە چاپ گەیەنراونو بڵاوکراونەتەوە، سەدان وتاری لە سەرتاسەری جیهاندا پێشکەش کردووە.

بە هۆی ئەو هەموو هەوڵو تێکۆشانو ماندووبوونەیەوە، لە ساڵی ١٩٨٦دا، شێخ دیدات خەڵاتی جیهانیی شا فەیسەڵی پێبەخشراوە.

**سەرەتای دەستکردنی شێخ دیدات بە کاری بانگەواز:**

شێخ دیدات سەبارەت بە دەستکردن بە کاری بانگەواز، بەم شێوەیە بۆمان دەدوێت:

* لە دوکانێکی نزیك لە کۆلێژی ئادەمز کارم دەکرد، خوێندکارەکانی ئەو کۆلێژە، تەبشیری بوون، بۆ کڕینی پێداویستییەکانیان ڕوویان لە دوکانەکەی ئێمە دەکرد، ئەوان کاتێك دەهاتنە دوکانەکەو دەیانبینی منو زۆرێك لە کارمەندانی دوکانەکە موسوڵمانین، سەبارەت بە ئیسلامو پەیامبەر (سەلامی خودای لێ بێت) قسەیان دەکرد، توانجیان لێ دەداین، ئەو کات منو هاوکارانم هیچ شارەزاییەکمان لەو بارەیەوە نەبوو؛ تا بتوانین وەڵامیان بدەینەوە، نەشارەزایی ئێمە، وای کردبوو کە خوێندکارانی ئەو کۆلێژە، ژیانمان بکەنە دۆزەخو نارەحەتی؛ چونکە ئەوان بەشێك لە ڕاهێنانەکانیان لەسەر ئەوەبوو، کە چۆن ڕووبەڕووی موسوڵمانان ببنەوە!

هەر کات بۆ کڕینی پێداویستییەکانیان بهاتنایە بۆ دوکانەکەی ئێمە، کۆمەڵێك پرسیاری ڕەخنەگرانەو توانجئامێزیان ئاراستە دەکردین، بۆ نموونە:

- ئایا دەزانن کە پێغەمبەر محەممەد، چەند خێزانی هەبووە؟

- ئایا دەزانن کە پێغەمبەرەکەی ئێوە، بە هێزی شمشێر ئایینەکەی بڵاو کردۆتەوە؟

- ئایا دەزانن کە پێغەمبەر محمد قورئانی لە ئینجیلو تەوراتەوە وەرگرتووە؟

بەداخەوە ئەو کات منو هاوکارانم لەو بارەیەوە هیچ شارەزاییمان نەبوو، نەماندەتوانی وەڵامیان بدەینەوە، ئێمە کەمترین زانیاریمان لەو بارەیەوە نەبوو، لەبەرئەوە هەڵوێستێکی دژوارو نارەحەت بوو، هەموو کات لە خۆمم دەپرسی: دەبێت من وەکو موسوڵمانێك، چۆن وەڵامیان بدەمەوە، ئایا وەڵامی ئەو هێرشانەیان بدەمەوە، ئەگەر بەڵێ؟ کەواتە: چۆن؟ خۆ من لەو بارەوەیەوە، هیچ زانستو شارەزاییەکم نییە.

ئەی دەکرێت لەم شوێنە بڕۆمو کارەکەم جێبهێڵم؟ خۆ لەو ڕۆژگارەدا، دەستکەوتنی کارو پیشەیەك، نەك هەر ئاسان نەبوو، بگرە زۆر قورسیش بوو!

ئەو هۆکارە وای لێکردم، کە خولیایەکی زۆرم بۆ خوێندنەوەو زانستو زانیاری هەبێت، لە بەرەبەیانی ڕۆژی پشووی ئەو هەفتەیەدا، ڕۆیشتمە گەنجینەی تایبەت بە سەرۆکی کارەکەمەوە، کەوتم بە سەر کۆمەڵە کتێبێکی زۆر کۆندا، دەستم کرد بە گەڕان بە دوای کتێبێکی باشدا؛ تا بیخوێنمەوە، دوای کۆششو گەڕانێکی زۆر، کتێبێکم دەست کەوت، کە بەرگەکەی مێروو خواردبووی، تەپوتۆزی زۆری لەسەر نیشتبوو، دوای ئەوەی کتێبەکەم پاك کردەوەو ناونیشانەکەی وەدەرکەوت، نووسرابوو (إظهار الحق)، (دەرخستنی ڕاستی)، کتێبەکە بە زمانی عەرەبی نووسرابوو، لە ساڵی ١٩١٥ لە هیند دەرچووبوو، واتە: سێ ساڵ پێش ئەوەی من لەدایك ببم؛ چونکە من لە ساڵی ١٩١٨ لەدایك بووم، ئەو کتێبە، سێ ساڵ لە من کۆنتر بوو!

ئەو کتێبە بووە هۆی گۆڕانی ژیانم بە تەواوی، لەو بڕوایەدام ئەگەر ئەو کتێبەم چنگ نەکەوتایە، نە دەگەیشتمە ئەو ئاستەی کە ئێستە پێی گەیشتووم، واتە: سەبارەت بە ئایینەکانی دیکەو بەراوردکردنیان بە یەکدی، نەمدەتوانی قسە بۆ خەڵکی بکەم!

بەو شێوەیەو ئەو شوێنە، بووە هۆی سەرەتای دەستپێکردنو سەرقاڵبوونم بە کاری بانگەوازەوە، سەرەتا ژیانی من لێرەوەو لە دوای خوێندنەوەی ئەو کتێبەوە دەستی پێکرد.

**هەندێك لە دانراوەکانی شێخ ئەحمەد دیدات:**

شێخ دیدات، سەبارەت بە بەراورد لە نێوان ئایینەکاندا، ژمارەیەك کتێبی نووسیوە، کە هەر یەك لەو کتێبانە، نزیکەی سەد هەزار دانەیان لێ چاپکرا.

* یەك لە کتێبەکانی شێخ دیدات، کە لە سەرەتاشەوە ئاماژەمان پێدا (کتێبی پیرۆز چی دەڵێت سەبارەت بە پێغەمبەر (سەلامی خودای لێ بێت))؟ ئەم کتێبە ٣٠٠٠٠٠ سێ سەد هەزار دانەی لێ چاپکرا.

* کتێبێکی دیکەی بە ناونیشانی (ئایا کتێبی پیرۆز، کەلامی خودای گەورەیە؟) دووسەدو شەست هەزار دانەی لێ چاپکرا.

* کتێبێکی دیکەی نووسیوە بە ناونیشانی: (لەخاچدانی مەسیح، لە نێوان ڕاستیو هەڵبەستندا).

* هەروەها کتێبێکی دیکەی بە ناونیشانی: (مەسیح لە ئیسلامدا) نووسیوە.

* کتێبی چارەسەری ڕەگەزپەرستی لە ئیسلامدا.

* کتێبی موسوڵمان نوێژ بەجێ دەهێنێت.

* کتێبی کێ بەردەکەی هەڵدا؟

لەگەڵ چەندین بەرهەمی دیکە..

**نەخۆشکەوتنیو کۆچی دوایی شێخ دیدات:-**

شێخ دیدات لە ساڵی ١٩٩٦دا، دوچاری نەخۆشییەکی سەخت بووەوە، ناچاربوو لەسەر جێگە بمێنێتەوە، دوچاری شەلەلی تەواوی جەستەی بوو، جگە لە دەماغی، هیچ شوێنێکی دیکەی کاری نەدەکرد، ڕۆژانە لەسەرتاسەری جیهانەوە، نامەی هەواڵپرسینی موسوڵمانانو هەوادارانی لە ڕێگەی تەلەفۆنو فاکسو ئیمەیڵەوە پێدەگەیشت.

شێخ دیدات، وەکو کەسێکی ئارامگرو ڕازیبوون بە قەدەری خودا، دانی بە خۆیدا گرتو جگە لە چاوەڕوانیی ئەجرو پاداشت شتێکی دیکەی لێ نەدەبیسترا؛ تا ئەو ساتەی لە بەرەبەیانی ڕۆژی دوو شەممە بەرواری "٨ ئابی ساڵی ٢٠٠٥"، لە باشووری ئەفریقیا، چاوەکانی لێکناو بۆ هەمیشە ماڵاوایی لە ژیان کرد.

و: ڕێڤان عەلی

# خەوی نیوەڕوان، بۆ منداڵ پێویستە؟

خەوی نیوەڕوان، پشویەکی کورتە، بەڵام بەسوودە بۆ منداڵەکانتان. هەندێك لە دایکان لەگەڵ خەوی نیوەڕواندا نینو دەڵێن ئەگەر منداڵەکەیان بە درێژایی ڕۆژ نەنوێت، شەوانە خێراترو ئاسانتر دەنوێت، بەڵام لە ڕاستیدا وا نییە. ڕێگا بدەن منداڵەکانتان ماوەیەك پشوو بدەن. ئەڵبەتە بەتەواوی شتێکی سرووشتییە بە زیادبوونی تەمەن، ماوەی کاژێرەکانی منداڵ بە درێژایی ڕۆژ تێیدا دەنوێت کەم دەبێتەوە، بەڵام باشترە ڕێگا نەدەن ئەم خووە باشە بە تەواوی فەرامۆش بکرێت. بەگشتی خەوی نیوەڕوان، سووکە خەوێکەو زۆرجار منداڵ خەونی ناخۆشی تێدا نابینێت، لە لایەکی دیکەوە، بەهۆی ڕووناکی ڕۆژەوە منداڵ ئاسانتر دەوروبەری خۆی دەبینێتو ترس لە دڵیدا دروست نابێت. ئەم هۆکارەشە وا دەکات منداڵ زیاتر بە ڕۆژ دەیەوێت بنوێت. ئەو منداڵانەی بەدرێژایی ڕۆژ نانوون؛ بە هۆی ئەو خەونە ناخۆشانەیە، کە شەوانە لە نووستنداو لە تاریکیدا دەیبینن‌و بێزاربوون، لە بەرامبەر ئەوەشدا بەرگری دەکەن لەوەی بە ڕۆژ نەخەون.

**١. خەوی نیوەڕوان‌و باشتربوونی شێوازی بایەلۆژی لە منداڵدا:**

زۆرێك لە منداڵانی خوار تەمەن پێنج ساڵ، بۆ سەلامەتیی جەستەیی‌و باشتربوونی هەڵسوکەوتو بەرزبوونەوەی ئاستی فێربوون، پێویستییان بە خەوی نیوەڕوانە. چ لە منداڵو چ لە کەسە پێگەشتووەکاندا، کاتێك نزیکی کاتی عەسر دەبێتەوە توانای فێربوونیان کەم دەبێتەوە، ئەم هۆکارەشە وا دەکات، پاش نانخواردن لە ڕووی دەروونییەوە، کەسەکان حەز دەکەن کەمێك پشوو بدەن‌و بنوون. لەم ڕۆژانەی ئەمڕۆدا، لە هەندێك لە وڵاتاندا، وەکو: ژاپۆن، تا ئێستاش لە فەرمانگەکاندا، کاتێکیان بۆ نانخواردنی نیوەڕۆو پشووی نیوەڕوان تەرخان کردووە.

**٢. خەوی نیوەڕوان وەك ئامادەکارییەك بۆ خەوی شەوانە:**

کاتێك منداڵ نیوەڕوان نانوێت، حاڵەتێکی هێرشبەرانەو تووڕەو شەڕەنگێزی هەیەو ئەم حاڵەشی تا کۆتایی شەو، کاتێك دەیەوێت بنوێت، بەردەوام دەبێتو بەدرێژایی خەوی شەوانیش ئارام نییە. خەوی نیوەڕوان بە مەرجێك بۆ ماوەیەکی زۆر نەبێت، تەواوکەری خەوی شەوانەو دەبێتە هۆی ئارامی منداڵ. منداڵێك لە ڕۆژدا پشوو بدات، گوشارەکانی کەم دەبێتەوە. کاتێکیش دەیەوێت بنوێت، لە ڕووی جەستەیی‌و دەروونییەوە، ماندوو نییە. ئەڵبەتە تەواوی سوودی خەوی نیوەڕوان، بە خەوی شەوانەوە، پەیوەستەو بەو مەرجەیە، کە خەوی نیوەڕوان پێش سەعات پێنج تەواو ببێت، جگە لەم شێوەیە منداڵ بەدرێژایی شەو، دوچاری گرفتی خەو دەبێت. کەواتە: هەوڵ بدەن کەمێك پاش نانخواردنی نیوەڕۆ، بۆماوەی کاژێرو نیوێك، منداڵەکەتان بخەوێنن، پاشان خەبەری بکەنەوە. ڕێگا مەدەن منداڵ بڕواتە: خەوێکی قووڵەوە؛ تا شەو بەئاسانی بنوێت.

**٣. خەوی نیوەڕوان‌و پشووی مێشك‌و جەستە:-**

ئەو منداڵانەی بە درێژایی ڕۆژ، سەرگەرمی یاریکردن‌و کەمتر پشوو دەدەن، ئەم هۆکارە وایان لێ دەکات، سووڕی خوێنیان خێرابێتو هەندێك ماسوولکەشیان دوچاری ئازار ببێت. نووستن‌و ڕاکشان، چارەسەری تەواوی ئەم گرفتانە دەکات.

**٤. کەمبوونەوەی بینینی خەونی ناخۆشی شەوانە:-**

منداڵێك کە بەدرێژایی ڕۆژ نانوێت، شەوانە دەڕواتە نێو خەوێکی قووڵەوە. بەهۆی ئەوەی ماوەی خەوەکەی دوورودرێژە، بۆیە لەو خەوە قووڵەدا، دوچاری بینینی خەوی ناخۆش دەبێتەوەو پەیتا پەیتا دەزریکێنێت، بەڵام چونکە چوەتە نێو خەوێکی قووڵەوە، ناتوانێت لەوە بگات کە دایك‌و باوکی، دەیانەوێت پارێزگاری لێ بکەن.

سەرچاوە: دستە: روانشناسی رشدو آموزش



# فێربوون

بوشرا ئەبوبەکر

ڕۆژێك کوڕێکی گەنج، ڕۆیشت بۆ لای شیڤاناو پێی وت: کە یەکێك لە ئەفسەرانی ئیمپراتۆر، خۆی و خاوو خێزانەکەی بێزار کردووەو هەر ڕۆژەو بە جۆرێك ئازارییان دەدات.

کوڕەکە وتی: ئەو ئەفسەرە یەکێکە لە پاسەوانە تایبەتییەکانی ئیمپراتۆرو زۆر شارەزایە لە هونەرەکانی جەنگو خێراییەکی بێوێنەو سەرسوڕهێنەری هەیە، بە جۆرێك کەلە سەرتاسەری وڵاتدا، کەسێکی خێرای وەك ئەو لە هونەرەکانی جەنگدا، بوونی نییە.. هەر لە بەر ئەمەشە کە کەس غیرەتی ئەوەی نییە بەرامبەری ڕابوەستێت، تەنانەت ئازاترین جەنگاوەریش ناتوانێت لە بەرامبەر خێرایی ئەودا، خۆی ڕابگرێت. ناویشی «کارەبائاسایە»!

ئێستا پێم بڵێ: من چۆن دەتوانم بەرگری لە خۆمو سنووری خانەوادەکەم بکەم؟

شیڤانا، خەندەیەکی کردو وتی: بانگهێشتی بکەو لە ڕووبەڕووبوونەوەیەکی مەردانەدا شکستی پێ بهێنە.

کوڕە گەنجەکە، خەندەیەکی تاڵی کردو وتی: تۆ چی دەڵێیت، ئەو «کارەبائاسایە»و بە خێراترین شێوە، لێدانەکانی خۆیم لێ دەدا، من چۆن دەتوانم بەخێرایی ئەو بجووڵێم؟؟

شیڤانا، بە هەمان ئارامیو خوێنساردیی پێشوویەوە، وتی: بانگهێشتی بکەو لە ڕووبەڕووبوونەوەیەکی مەردانەدا، شکستی پێ بهێنە.

بۆ ئەمەش لە بەیانییەوە، وەرە بۆ لام؛ تا فێری شێوازی ڕووبەڕووبوونەوەی «کارەبائاسا»ت بکەم.

ڕۆژی دواتر کوڕە گەنجەکە، جلی مەشقکردنی لەبەر کردو بە تەواوی خۆی بۆ فێربوون ئامادە کردو ڕۆیشت بۆ لای شیڤانا.

شیڤانا، لە جێگەی خۆی هەستاو دەستی کرد بە ئەنجامدانی ئەو جووڵانەی کە دەیویست فێری کوڕە گەنجەکەی بکات، بەڵام سەیر لەوەدا بوو، شیڤانا جووڵەکانی بە خێراییەکی ئێجگار کەم ئەنجام دەدا، بە ڕادەیەك بۆ جووڵەی زۆر ئاسایی چەند کاتژمێرکی پێدەچوو، سەرەتا کوڕەکە، بە سەرسوڕمانەوە تەماشای دەکرد، کە خۆی تەواو بوو داوای لە کوڕەکە کرد، هەمان جووڵەکانی ئەم، بەخێراییەکی کەمتر ئەنجام بدات..

کوڕەکە وتی: من دەڵێم بەرامبەرەکەم «کارەبائاسا»ی ئیمپراتۆرە، ئەو کات تۆ داوام لێدەکەیت، بەم جووڵە کیسەڵیانە ڕووبەڕووی ببمەوە..ئاخر من چۆن دەتوانم بەم شێوەیە، شکستی پێ بهێنم؟

شیڤا ناوتی: ئەمە تاکە ڕێگەیە، هیچ ڕێگایەکی دیکە، بوونی نییە.

گەنجەکە ناچار دەستی کرد بە ئەنجامدانی جووڵەکان، بە خێراییەکی کەمتر.

جووڵەیەکی خولانەوەی ئاسایی کە لە چەند چرکەیەکدا ئەنجام دەدرێ بە دەستووری شیڤانا، بە چەند کاتژمێرێك ئەنجامی دەدا.

ڕۆژان ڕۆیشتنو سەرەنجام ڕۆژی ڕووبەڕووبوونەوە گەیشت.

کاتێك ئەفسەرەکە گەیشت، گەنجەکە داوای لێکرد کە دەست هەڵبگرێت لە بێزارکردنی خاووخێزانەکەی، بەڵام «کارەبائاسا» بەبێئەوەی هیچ بڵێت، دەستی برد بۆ شمشێرەکەی، گەنجەکە بەخێراییەکەی سەرسوڕهێنەر، ڕووبەڕووی ئەفسەرەکە بووەوە، لە چەند چرکەیەکدا «کارەبائاسا»ی دا بە زەویدا..

هەمووان سەریان لە خێراییەکەی سوڕمابوو.

گەنجەکە چوو بۆلای شیڤاناو لێی پرسی: ئەی مامۆستای ئازیزم، خۆ هەموو جووڵەکانم زۆر بە هێواشی ئەنجام دەدا، چۆن توانیم لە بەرامبەر ئەودا، بەو ڕادەیە خێرا بم؟؟

شیڤانا وتی: ئەنجامدانی دانە دانەی جووڵەکان بە خێراییەکی کەم، بووە هۆی ئەوەی کە لەشت زۆر بەجوانی فێری جووڵەکان بێتو لە کاتی گونجاودا بە خێرایی گونجاو بەکاریان بهێنیت..

لە ڕاستیدا، خێرایی تۆ لە جووڵەکانتدا، دەگەڕێتەوە بۆ خاوێت لە مەشقکردن بۆیان.

هەرچەند ڕاهێنانو مەشقکردن بۆ کارەکان خاوترو وردتر بێت، خێراییو بەباشی ئەنجامدانیان، لەکاتی پێویستدا زیاتر دەبێت.

کەواتە: گەر دەتەوێت ژیانێکی سەرکەوتوانەت هەبێت، دەبێت دەست هەڵبگریت لە پەلەپەلو خێرایی ناپێویست.

تەنها بە ئارامیو دانبەخۆداگرتن، دەتوانیت کۆنترۆڵی خێراترینو سەختترین کارو کاتی ژیانت بکەیت.

نهێنیی سەرکەوتن زۆر سادەیە: هێواش مەشقکردنە..

سەرچاوە: سایتی Niksalehi

# دایك

شەهێن حسین

بوونەوەرێكو دروستكراوێكی پەروەردگار، كە بەهەشتی خستۆتە ژێر پێیەكانی، ڕازیبوونی لەگەڵ ڕازیبوونی پەروەردگارە، سۆزو میهرو وەفادارییەكەی بێبەرامبەرە، خۆشەویستییەكەی لە ناخی دڵەوەیە، ئەرككێشانو ماندووبوونو ئازارچەشتنی لەگەڵمان بە عیشقەوەیە، تاكە كەسە كە بەوپەڕی دڵسۆزی لە پەنهانیو بێئاگایی خۆمان، هەمیشە دەستی نزاو پاڕانەوەكانی ڕووەو ئاسمان بەرز دەكاتەوە، لە پێش تكاكردن بۆ خۆی نزاو پاڕانەوە بۆ ڕۆڵەكانی ئەكات، لەبەر خەمخۆریو بەتەنگەوەبوونی ئێمە خۆی لەبیر ئەكات، پێنووسو پەرتووك لە نووسینو باسكردنی وەفاو ئەمەكداری دایك، هەمیشە دەستەوسان ئەبێت، تەنها ئەتوانین بڵێین؛ كە هەر شتێك لە ژیانماندا جوانو شیرینو خۆشەویستو بوێرو دڵسۆز بێت، ئەیشوبهێنین بە دایك.

سۆزو میهرەبانی دایكو هەبوونی لە ژیانی تاكدا، گرەنتی تاكێكی دەروونڕووستو دوور لە تاوانە لە كۆمەڵدا، بەڵگەشمان بۆ ئەم قسەیەمان ئەوەیە كە زۆرینەی تاوانباران كەسانێكن كە بێ دایك گەورە بوونو دووربوون لە سۆزو ئامێزو بەزەیی دایكانە، ئەمەش وای كردووە ڕەحمو بەزەیی لە دڵیاندا گەشە نەكاتو بەرەو ژینگەی تاوان هەنگاو بنێن.. لەگەڵ ڕێزی زۆرم بۆ ئەو مندالانەی ئێستا دوور لە نازی دایكیان ژیان دەگوزەرێنن، بەڵام هەوڵ ئەدەن هەمیشە ئامۆژگارییەكانی دایكیان پراكتیزە بكەنو ڕۆحی دایكیان شادو ئاسوودە بكەن!

لەهەمان كاتدا نابێت ئەوە لە یاد بكەین كە چەندە دایك ڕۆحی وابەستەی منالو جگەرگۆشەكانییەتی، بە هەمان شێوە ڕۆڵەكانیشی هەمان هەستو ئالوودەییان بۆ دایكیان هەیە، ئەی ئەوە نییە منالیش بە دایكی نەبێت بە كەسی تر ئارام ناگرێت، ئەوە نییە هەمیشە دایك لە پێشترو ئازیزترە لامان وەك لە باوكمان، لەو كاتەی كە لە تەمەنی منالیداین هەمیشە گریان ئەكەینە چەكی دەستمان بۆ نەبڕان لە دایكمان، بۆ دەستكەوتنی ئامێزی گەرمی دایكمان، بەردەوام ئەگرینو ئەنوزێینەوەو دەستەكانمان لە پۆشاكەكەی گیر ئەكەین، سا بەڵكو خوایە دایكمان هەستی بجوڵێتو جێمان نەهێڵێتو بمانگرێتە باوەشی، كاتێكیش گەورە ئەبین دڵو دەروونمان هۆگری بۆنی خۆشی دایكو هەستو سۆزی ئەبێت، هەر بە بینینی ڕوومان گەش ئەبێتو ڕووناكی بە ناخماندا تیشكەكانی بڵاوە پێ ئەكاتو خەندە ئەهێنێتە سەرلێوەكانمان، بە پێچەوانەوە، كاتێك دیار نابێتو لێمان دوور ئەبێت، ڕوو گرژیو تاریكی ڕووخسارمان دائەپۆشێت، وەك بڵێی خوای پەروەردگارمان جۆرێك لە ڕووناكی وەهای بە دایكمان بەخشی بێت، كە لە هەر كوێ بن ئەو ناوچەیە ڕووناك بكەنەوە..

خۆشەویستیو ئامێزی دایك هێندە ئارامبەخشەو خەمڕەوێنە، كە هیچ مرۆڤێكی تر لە دونیادا ناتوانێت جێگەی سۆزی ئەو بگرێتەوە، ئەوە نییە كاتێك دایك كۆچی دوایی ئەكات ئیتر لە دوای خۆی ڕۆڵەكانی وێڵو سەرگەردان ئەبنو بێنازیی دایكیان پەرتەوازەو سەرلێشێواو ئەبن، مرۆڤ هەمیشە لە تەمەنی منالیدایە تا كاتێك دایكی لە ژیاندا بێت، بەڵام بە لەدەستدانی دایكی، ڕاستەوخۆو كتوپڕو لە ناكاو پیر ئەبێت..

هەر ئەوەی كە بەهەشت لەژێر پێیەكانییەتی، ئەوە لوتكەی ڕێزو پاداشتی دایكانە، كەسێكیش كە بەهەشتی نەبڕاوەی بوێت ئاسانترین ڕێگەیە كە لێوەی بگاتە شوێنی مەبەست..

# پەروەردەی ڕۆشنبیریی منداڵ



گوڵان حەمەئەمین

ڕۆشنبیرکردنی منداڵ، لەهەر بوارێك لەبوارەکانی ژیاندا، یەکێکە لەئەرکەکانی دایكو باوكو نابێت دایكو باوك منداڵەکەیان بدەنە دەست کۆمەڵگاو خۆیان لەو بەرپرسیارێتییە لابدەن، دیارە هەموو ئەو بوارانەی باسمان لێوە کردووە لە ژمارەکانی ڕابوردوودا، وەك پەروەردەی ڕۆحی، پەروەردەی کۆمەڵایەتی، ئارەزوو... هەمووی لەژێر ناونیشانی ڕۆشنبیرکردندا جێی دەبێتەوە. ئەوەی لەم ژمارەدا باسی لێوە دەکەین، بریتییە لە ڕۆشنبیرکردنی منداڵ، لە ڕووی زانستو زانیارییەوە. وەك ئاشکرایە زۆرێك لەو کێشانەی لاوی ئێستا گیرۆدەی بوون، هۆکارەکەی دوورەپەرێزییە لە زانستو زانیاری، کە ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ دووریی خێزان لەو بوارە. کەواتە: جێی خۆیەتی، خوێنەر بپرسێت، لە چ تەمەنێکەوە، منداڵەکانمان ڕۆشنبیر بکەین؟ چۆنو بەچ ڕێگایەك، هەوڵیان لەگەڵدا بدەین؛ تا خولیای زانستو زانیاری بن؟ زنجیرە بابەتەکانی ئێمە لەم گۆشەیەدا، باسمان لە تەمەنەکانی سەرەتای منداڵ کردووەو ئێستا لەباسی مێردمنداڵیداین، بەڵام بواری ڕۆشنبیرکردنی منداڵو پەروەردەکردنی لەسەر خولیابوونی زانستو فێرخوازی، لە سەرەتای تەمەنی منداڵەوە دەست پێدەکات. دیارە چەندین ڕێگای گرنگ هەیە، کە پێویستە بگیرێتە بەر؛ لە پێناو ئەوەی منداڵەکانمان ڕۆشبیر بکەین. لەوانە:

١- **پێشەنگی دایكوباوك:** هەموومان ئەو ڕاستییە دەزانین، کە منداڵ زۆر چاو لە گەورەکان دەکاتو ئەو کارانە دوبارە دەکاتەوە کە ئەوان ئەنجامی دەدەن، ئەگەر هەرلە منداڵییەوە ببینێت دایكو باوك سەرقاڵی خوێندنەوەن، یاخود لەنێو خێزاندا، گفتوگۆ لە بوارێکی سوودبەخشو فێرخوازییەوە دەکرێت، ئەویش بەو بوارەوە خۆی قاڵ دەکات.

٢- **کتێب وەك دیاریی دەست:** با دایكو باوك هەوڵ بدەن زۆرترین کات، دیارییەکانیان بریتی بێت لە کتێبو گۆڤارو نامیلکە؛ کە بابەتی سەرنجڕاکێشیّ لەخۆگرتبێت، لە هەمانکاتدا ڕەچاوی دیزاینو بەرگی جوان بکرێت، چونکە لەو تەمەنەدا تەنها ناوەرۆك کاری لێناکات بەڵکو ڕواڵەتێکی نایابیش پێویستە.

٣- **سەردانی کتێبخانە:** هەندێك لەکاتی چونەدەرو کاتە تایبەتەکان، تایبەت بکرێت بەسەردانی کتێبخانەو پێشانگاکانی کتێب، بەڵام بیرتان نەچێت تەنها سەردانی کتێبخانە، بەس نییە. لێرەدا پێویستە پێش سەردانەکە، لە دڵو ناخیدا، سەردانەکەی بەگرنگ پیشانی بدەیت، بۆ نموونە بڵێ: فڵان ڕۆژ دەتبەم بۆ شوێنێکی خۆش، بۆ پێشانگایەکی کتێب، یاخود بۆ کتێبخانە، کتێبی زۆر خۆشی لێیە، کتێبت بۆ دەکڕم، یاخود ئەگەر فڵان کار بکەیت، ئەوکات دەتبەم.

٤- **کتێب دابەزاندن:** لەسەر ئایپادو کۆمپیوتەر، تەنها یاری بۆ دامەبەزێنە، بەڵکو کتێبو قاموسو ئەو یارییانەی یادگەی چالاكو بەهێز دەکات، داببەزێنە.

٥- **پێشبڕکێی کتێب خوێندنەوە:** لەگەڵ هاوڕێکانی، یاخود خوشكوبراکانیدا پێشبڕکێیان پێبکە، لەسەر خوێندنەوەی کتێبێك، یا چیرۆکێك، یاخود وەرگێڕانێك.

٦- **لێپرسینەوە:** کاتێك دیاری بکە بۆ لێپرسینەوەو لەگەڵ منداڵەکەتدا دابنیشەو بپرسە لێی: بزانم چ چیرۆکێکی خۆشت خوێندۆتەوە، بۆم باسبکە؛ تا خوێندنەوە دەبێت بە خولیای.

٧- **هەڵبژاردنی بوار:** ڕەچاوکردنی ئەو بوارەی منداڵەکەت حەزی پێیەتی، لەو بوارەدا، کتێبی بۆدەست بخە.

٨- **خوێندنەوە بۆ دەوروبەر:** فێری بکە بۆ خوشكو برا بچووکترەکانی بخوێنێتەوە.

خۆشەویستانم، ئەوەش بزانین، کە تەنها خوێندنەوە، ڕێگا نییە بۆ ڕۆشنبیرکردنی ڕۆڵەکانمان، بەڵام خوێندنەوە سەرەتێکی گرنگە بۆ ڕۆڵەکانمانو پێویستی بە تەمەنێك هەیە بۆ ڕاهێنانیان لەسەر خوێندنەوە.

**چەند هۆکارێکی دی لە هۆکارەکانی ڕۆشنبیرکردنی منداڵەکانمان بەزانستو زانیاری:**

١- شێوازی گفتوگۆکانی نێو خێزانو سەرقاڵیی خێزان بەو بوارەوە.

٢- بەکارهێنانی سەرجەم هۆکارەکان، لەپێناوی ڕۆشنبیرکردنی منداڵ. وەك: دەستخستنی فیلمی زانستی، دابەزاندنی بەرنامەی فێرکاری...

٣- سەردانی مۆزەخانەو شوێنە مێژووییەکان، تەنانەت چاپەمەنیو تۆمارگەکانیش. وەك ئاشکرایە منداڵ تەواوی ئەو شوێنانە سەرنجی ڕادەکێشێت.

٤- بەشداری پێکردنی منداڵ، لە خولی ڕاهێنان، بەتایبەت لەئێستادا کە پشووی هاوینە، دەکرێت لە هەوڵی ئەوەدا بیت شوێنێکی گونجاو دەستنیشان بکەیت؛ تا منداڵەکەت بەشێك لە کاتەکانی تەرخان بکات بۆ خولێك؛ لە بوارێك کە حەزی پێیەتیو خاوەن بەهرەیە تێیدا.

٥- هەوڵی دۆزینەوەی لێهاتووییەکانی منداڵەکەت بدەو گرنگی بدە بەو بوارەی توانای منداڵەکەتی تێدا دەبینێتەوە، نەك ئەو بوارەی تۆ حەزت پێیەتی، دڵنیاش بە لەوەی هیچ منداڵێك بێتوانا نییە.

# ڕوانینی من‌و حیکمەتی خودا!

بێگەرد فارس



گەنجێك دەڵێت: منداڵم زۆر خۆشدەویست، هەموو خەون‌و خولیام ئەوەبوو: خێزانێکی بچکۆلە پێکبهێنم‌و منداڵمان ببێت، هەمیشە دەمگوت: کاتێکی زۆر بۆ یاریکردن‌و خۆش بەسەربردن لەگەڵ منداڵەکانمدا تەرخان دەکەم، کچێکم خۆشویست بە نیازی هاوسەرگیری، هێندە عاشقی بووم، هەستم دەکرد ئەگەر ئەوم بۆ نەبێت، هەموو دونیا کۆتایی دێت، تەنانەت بۆ ساتێکیش نەمدەتوانی لەیادی بکەم، لە کۆمپانیایەك بەبڕی (٨٠٠) دۆلار مانگانە کارم دەکرد، ڕۆژێك خۆشەویستەکەم پەیوەندیی پێوەکردم‌و گوتی: کۆمپانیایەك داوای فەرمانبەردەکات مانگانە بە بڕی (١٥٠٠) دۆلار، منیش کە ئەوەم بیست، یەکسەر ڕوخسەتم لە بەڕێوەبەرەکەم وەرگرت‌و بەرەو ئەوێ بەڕێ کەوتم، بەتایبەتی کاتێك زانیم مانگانەکەی، دوو هێندەی ئەو بڕەیە، کە لەکۆمپانیاکەی خۆم وەری دەگرم. زۆر بەپەرۆش بووم بۆی، کاتێك بەڕێوە بووم، لە خۆشیدا سەیری دەوروبەری خۆمم نەدەکردو هەر ملم دەنا؛ بۆئەوەی بتوانم هەموو ئەو پێداویستییانە دابین بکەم بۆ خۆشەویستەکەم؛ چونکە داواکاری زۆربوو؛ تا ئەو کاتەی تووشی ڕووداوی ئۆتۆمبیلێك بووم، کە شۆفێرەکەی ئافرەتێك بوو، هێندە بەخێرایی لێی دەخوڕی، نەیتوانی کۆنترۆڵی خۆی بکات‌و لێیدام، کاتێك بە ئاگا هاتمەوە، لە نەخۆشخانە بووم، هەستم بە قاچی ڕاستم نەدەکرد، چاوەکانم هەڵهێنا بینیم ئافرەتێکی شۆخ‌و شەنگ چەپکێك گوڵی بەدەستەوە بوو، لەلای سەرما ڕاوەستابوو، زەردەخەنەیەکی بۆکردم، پێم گوت: تۆکێیت؟ ئەی من لە کوێم؟

گوتی هێمن بە، ئێستە هەموو شتێکت بۆ ڕوون دەکەمەوە، بەهۆی ئازاری قاچمەوە هاوارم کرد، لەو ساتەدا پزیشك هاتە ژوورەوەو دەرزییەکی ئارامکەرەوەی لێدام‌و گوتی: ئارام بە بەهۆی بەهێزی پێکانەکەتەوە قاچی ڕاستت بڕدراوەتەوە، دەستم کرد بەگریان، ئافرەتەکەش زۆر بەڕێزەوە لەلاما دانیشت‌و وتی: داوای لێبوردن دەکەم، بەهۆی هەڵەی منەوە، تۆ تووشی ئەوە بوویت. پەیوەندیم بە خۆشەویستەکەمەوە کردو پێم گوت: تووشی ڕووداو هاتووم، بەخێرایی خۆی گەیاندە نەخۆشخانە، کاتێك بینیمی، تووشی شۆك بوو، نەیتوانی هیچ وشەیەك بدرکێنێت، هێندە نەبێت گوتی: داوای لێبوردن دەکەم، بەهیوام زوو چاك ببیتەوە، پاشان ڕۆیشت.

دوای کەمتر لە نیوکاتژمێر، نامەیەکی بۆ ناردم، نووسیبووی: ببورە، من ناتوانم چاوەڕێی تۆ بکەم، داواکارم هاتووەو ماڵەوەش زۆرم لێدەکەن، کە هاوسەرگیری لەگەڵدا بکەم، پاشان مۆبایلەکەی داخرا، دواتر زانیم ژمارەکەی گۆڕیوە، ئافرەتەکەش بەمەی زانی، دەستیکرد بەگریان‌و سەیری دەکردم؛ چونکە خۆی بەهۆکاری هەموو ئەمانە دەزانی. پاش تێپەڕبوونی دوو هەفتە، پزیشك ڕێگەی چوونەدەرەوەیان پێدام‌و سات بەسات لەگەڵمدا بوو، هەتا گەڕامەوە ماڵەوە، کاتێك گەیشتمە ماڵەوە، بە هەموو هێزی خۆم هاوارم کردو گوتم: بۆچی خودایە گیان؟ بۆچی وام لێ هات؛ تا خۆشەویستەکەم بەجێم بهێڵێت؟ بۆچی هێشتت ئەو کارەم لەدەست دەربچێت؟ خودایە گیان بۆ دەبێت درێژایی ژیانم، بە کەمئەندامی بەسەربەرم؟ بۆچی؟ خەم‌و خەفەتم درێژەی نەخایاند، بەتایبەتی کە من بەتەنیا نەبووم، نکوڵی ناکەم ئافرەتە شۆفێرەکە، هەموو ڕۆژێك سەردانی دەکردم، هەر ڕۆژێك دوا بکەوتایە، هەستم بەتەنیایی دەکرد.

* دوو مانگ بەسەر ئەو ڕووداوەدا تێپەڕی، من‌و هاوڕێیەکم

ناومان بۆ سـەربازی هاتەوە، بەڵام بەهۆی ئەو ڕووداوەی بەسەرم هاتبوو، لە من خۆشـبوون، بەڵام هاوڕێکەم ڕۆیشـت بۆ خزمەتی سـەربازی، کـە دەبوایە پێکـەوە بووینایە، چونکـە منداڵی یەك سـاڵ بووین، زۆربە داخەوەبـووم؛ چونکـە دوای چەند مانگێك تەقینەوەیـەك ڕووی داو بووە هۆی مردنـی هاوڕێکەم، زۆر بۆی گریام، سوپاسی خودای گەورەم کرد، لەسەر نەڕۆیشتنم بۆ ئەوێ!

* ڕۆژان هاتـنو چـوون، سـاڵانێك تێپـەڕی، ڕۆژێك لە ڕێی هاوڕێیەکمـەوە زانیـم خۆشەویسـتەکەی ڕابـوردووم لەگـەڵ دراوسـێیەکیاندا هاوسەرگیری کردووەو کێشـەیان هەیە؛ چونکە دکتۆر پێی وتـووە نەزۆکەو هەرگیز منداڵـی نابێت، هەرچەندە خەمم بۆ خوارد، بەڵام زۆر سوپاسـی خودای گەورەم کرد، لەبەر ئەوەی من شەیدای منداڵ بووم!

* ڕۆژێك ڕۆژنامەم دەخوێندەوە، بینیم ئەو کۆمپانیایەی پێشتر داوای فەرمانبەری دەکـرد، بەهۆی قەرزی بانکەوە مایەپووچ بووەو بەهۆیەوە هەموو فەرمانبەرەکانی لەکار دەرکردووە، دووبارە سوپاسی خودای گەورەم کرد؛ بۆ ئەو ڕەحمەتە فراوانەی بۆم هەیبووە.

بـە درێژایی هەموو ئەو ماوەیە، ئافرەتەکە ڕۆژانە سـەردانی دەکـردمو هەمـوو پێداویسـتییەکانی ژیانمی بۆ دابیـن دەکردم، بڕیـارم دا داوای هاوسـەرگیری لـێ بکەم؛ چونکـە زۆرم خۆش دەویسـت، بەڵام دەترسـام ڕەتی بکاتەوەو بە تەواوی لە دەسـتی بـدەم، کاتێك هات چـای بۆ ئامادە دەکردم بە شـەرمێکەوە پێی گوتـم: ئەمەوێ بابەتێکی گرنگت لەگەڵدا بـاس بکەم، ئەگەر تۆ ئەوەت بوێت، من دەمەوێت هاوسـەرگیری بکەین، منیش هەموو گیانم کەوتـە لەرزینو گوتم: تۆ دەڵێیت چی؟ گوتی: ڕەزامەندی دەنوێنیت؛ تا هاوسـەرگیری بکەین؟ منیش گوتم: پێویسـتم بە بەزەیی نییە، ئەویش گوتی: سـوێندت بۆ دەخۆم من بەزەییم بە تۆدا نایەتەوە، بەڕاسـتی پێم خۆشە هاوسەرم بیت، منیش گوتم دەبینی؛ من قاچێکم لە دەسـت داوەو ئێسـتەش بێکارم، ئەویش گوتـی: نەخێر تـۆ کارت هەیەو دەبیتە بەڕێوەبـەری یەکێك لە کۆمپانیاکانی باوکم، کارەکەش هێندەیە لە ئۆفیسـێکی تایبەت بە خۆت دەبیتو پێویست بە جووڵە ناکات!

هیچم بۆ نەدەگوترا، لەبەر گریانی خۆشـیو داوای لێبوردنم لـە خودای گـەورە کرد، ببورە خودایە گیـان، کە حیکمەتی تۆم بۆ داهاتووی خۆم نەدەبینی، ئەگەر ئەو ڕووداوە نەبوایە دەبوو:

١- ئافرەتێکی نەزۆکی خۆپەرستم بهێنایە.

٢- دەبوو بچوومایە بۆ سەربازیو بەر تەقینەوە دەکەوتم، تۆ قاچێکت لێ سەندمەوەو ژیانت پێ بەخشیم.

٣- کارێکـم دەسـت دەکـەوت، کە پاش ماوەیەکـی کورت لە دەسـتم دەدا، ئێسـتە کارێکم دەسـتکەوتووە، بە خەونیش بیرم لێنەکردووەتەوە.

ئازیزان: هەمیشە متمانەتان بە خودای گەورە لە لوتکەدا بێت، لەبەر ئەوەی هەرشتێك هەڵبژاردەی خودای گەورە بێت، بۆ ئێوە زۆر بەسـوودترە لەوەی کە خۆتـان هەڵیدەبژێرن، یان ئارەزووی دەکـەن، دڵ تەنـگ مەبـن، کاتێك کەخوای گەورە شـتێکتان لێ دەسەنێت، بێگومان شتێکی زۆر لەوە باشترتان پێ دەبەخشێت.

# مەزنەکان

## سایە سەرگەتی

چـراکان بکوژێننەوە، ڕووناکی ڕۆحە زیندووەکان بەسـە بۆ ڕووناککردنـەوەی ئەم مانگـە، ئەو ڕۆحانەی لەپێنـاو خودا، تا سـپێدە دەمێننەوە، ئەوانـەی ڕقەکانی خۆیـان دەخۆنەوە، ئەو ڕۆحانەی کە جەستەکانیان پیرۆز کردووە.

لەوپـەڕی پیرۆزییەوە، لەبەرزترین ئاسـتی خۆبەکەمزانین، عاشـق دەبن، تا ڕادەی پەرستن، لە پێناو عەشقەکەیاندا، هەموو ئازارەکانی دونیا بەرگە دەگرن.

بەردەوام دەبن لەڕێکردن، ڕێگە پڕ دڕكو چاڵەکان بۆنخۆشو زامەکان سارێژ دەکەن، دڵۆپ دڵۆپ فرمێسکەکانی خەڵکی دەسڕنو دەیانخەنـە نێو ئیمپراتـۆری میهرەبانییەوە، هەمیشـە خەندە خـاوەن ماڵیانـە، بەڵام کاتێك ڕازەکانیان بۆ خـودا باس دەکەن، چاوەکانیان وەك ئاسـمان پڕە لە ئەستێرە، گۆناکانیان دەریایەکە لەفرمێسـك، دەسـتەکانیان سـارد وەك بەفـر، پێیـان لەرزۆك، دڵیـان گەرم گـەرم، ترس دای گرتـوون، تـرس لەجیابوونەوە، دوورکەوتنەوە لە خودا. ئەوان دەڵێن: خۆ داهاتوو بەدەست ئێمە نییە؛ تا ئاسـوودە بین، ئەم نائاسوودەییەش ئەوانی گەیاندووەتە بەرزترین ئاستی مرۆڤایەتی.

لەڕێگـەی چـوون بۆ لای خـودا، ڕێگە نـادەن هەرگیز خەو بیانباتـەوە، یادی خـوداو ویردەکان، وشـە ڕووخێنەرەکانی بیر بردوونەتـەوە، سوپاسـگوزاری کاتـە باشـەکانن، تەنانەت پێش ئەوەی ڕوو بدەن، لەکاتە سـەختەکاندا، زۆر خۆشـحاڵن، دەڵێن: خودا دەیەوێت دەنگمان ببیسـتێت، لەم کاتەدا، سـەریان نەویو دەسـتەکانیان بـەرز دەکەنـەوە، بەڕێـزەوە سـڵاو دەنێـرن بۆ خۆشەویستی خودا (دروودو سڵاوی خودای لێ بێت)، بەسادەترین ئاوازی دڵ، زۆر عاشـقانە، داوای میهرەبانی لە یار دەکەن، خودا بە خاوەنی هەموو شتێك دەزانن، لەبەرئەوە داوای هەموو شتێك لەو دەکەن، ئەوان ئارامیو سوپاس، یاسایی ژیانیانە، بێئومێدنین لـە میهـری خاوەنەکەیـان، دوای هەڵکردن، دەوەسـتن، نارۆنو دەگەڕێنەوە بۆ ناو ئاسـوودەیی، ئـەوان مەزنەکانن، ئەوانەی کە بەمەزنی لەدایکبوون، بەمەزنی ژیاون، بەمەزنیش دەمرن.



# ئیدی مەڕۆ

کە تۆ دەڕۆی، گوڵەباخەکان هەموو دەتۆرێن، چۆلەکەکانی باخچەکەمان ناجریوێنن، وەکو منداڵە ئاوارەکان، ڕێگای هێلانەکانی خۆیان لێ ون دەبێ!

ئەو ئێوارانەی تۆ جێم دێڵی، مانگیش ناگەڕێتەوە! تریفەش سیا دەپۆشێو ئەستێرەکانیش دەگرین!

کە تۆ دەڕۆی، گوڵستانی دڵم هەڵدەپرووکێو سۆمای چاوم لێڵ دەبێو خانەی دڵم خامۆش!

زهووری نووری تووری مەعریفەت بۆ چاوی بێ نوورم
لە تۆزی سورمە ڕەنگی خاکی دامانت نەبێ، نابێ. ناری.

کە تۆ دەڕۆی، ئیدی هەموو شتێک لە دەریای عەدەمدا ون دەبێت!

ئیدی لە غیابی تۆدا، وجوودێک نامێنێ!

گەڕان بەشوێن تۆدا، گەڕان بوو بەشوێن خۆمدا!

ئەو کاتەی گەیشتم بە تۆ، گەیشتم بە خۆم!



تۆ خەڵاتی خوداوەندی بۆ من،...........

خوداوەند تۆی نارد؛ تا مەرهەمی برینەکانم بی، ناسنامەو شوناسی ڕۆحم بی، دەستێکی ئاوریشمین بی‌و ئاسوودەیی ببەخشی بە ناخم!

کە دەڕۆی، من بێکەس دەمێنمەوە، من بێ تۆ ناژیم!

یا ژیان لەگەڵ ڕووی تۆ، تا مردن
یا مردن لەگەڵ یادی تۆ کردن . ویـــران .

چونکە لە سایەی ئەوینی تۆدا، گاڵتەم بە تاجی پاشایەتی دێ‌و هەموو دونیا بە چرکەیەك لەگەڵ تۆدا، بەفەخرەوە ئاڵوگۆڕ دەکەم!

من ئامادەم بۆ پاداشتی هەنگاوێکت، ڕۆحی خۆم ببەخشم!

چونکە مردنم لە دامێنی عیشقی تۆدا، پێ گەورەترە لە هەزاران ساڵ ژیانی بێتۆیی!

تەبیبی دەردی هیجرانی، منیش بیمارو مەهجوورم
کە هاتی دێتە دەر ڕۆحم، لەباتی ئەجری هەنگاوت ـ حەمدی ـ

تۆ ئەو خەڵاتە خوداییەی کە هەرگیز ناتوانم سوپاسگوزاری خودای لەسەر تەواو بکەم، گەر لوتفی خودا نەبا، من چۆن دەگەیشتم بە تۆ!

ئەگەر مرۆڤەکان، بەشوێن نیوەی دووەمی خۆیاندا وێڵ بووبن، ئەوا من نیوەی یەکەم‌و دووەمم لای تۆ بوو!

ئیدی چۆن دەمتوانی بتدۆزمەوە؟!

من هەژاری فەیزی تۆم، من موحتاجی کەرەمی تۆم، بۆ هەمیشەی هەمیشە!

من بەشەرعەن موستەحەقم؛ بۆ زەکاتی حوسنی تۆ
تۆ کە ساحێب دەوڵەتی، بێ بەش لە ئیحسانم مەکە ـ ناری ـ

تۆ سەداو زایەڵەی هاواری ڕۆحم بووی.

تۆ حیکایەتخوانی شەوانی درێژی زستانو دەستی نەرمی ژێرسەرم بووی، تۆ مەحرەمی ڕازونیازم بووی.

تۆ میحرابی ئەوینو بەرماڵی نوێژو گۆچانی دەستو کەشکۆڵی عیشقم بووی!

تۆ مەدرەسەی ئەوینو ئوستادی عومرم بووی!

تۆ ئەی شازنی خەیاڵو خەزنەداری دڵو دەوڵەتداری ڕۆحم، سیرڕی وجوودی منی!

تۆ نەبای، من جگە لە تەلیسمێکی ئاڵۆزی بێ مانا، چیدی نەبووم!

تۆ نەبای، نەمدەزانی چیم‌و کێم!!

تۆ نەبای، من جگە لە توولەڕێیەکی باریك، هیچی دیم نەدەدی!

تۆ هاتی‌و منت بە خۆم ئاشنا کرد!

دەستت گرتم بەرەو زەریای زیوو مەملەکەتی ئەوین!

تۆ هاتی‌و منت لە کۆیلایەتی ڕزگار کردو تاجی شاهانەت خستە سەرم، ئەی ئیمپراتۆری دڵم!

هۆ شازادە بەهەشتییەکە، تۆ نەبای کێ سروودی بەهەشتی هێنابا؟!

تۆ نەبای، کێ گوڵزاری پاکیزەیی، بە شەونمی عەفاف دەشۆری؟!

تۆ نەبای، کێ مرۆڤەکانی بە بەفراوی پاکی‌و وەفاو خۆشەویستی‌و ئەوین بیسمیل دەکرد؟!

بەخشینی ڕۆحم بە تۆ، شازادەکەم.. بچووکترین دیاریی منی هەژارە.. وەگەرنا، کەی شایانی ئەوەیە شاباشی تۆ بکرێ!!

ڕەسمی عاشق، واز لە ڕۆح هێنانە بۆ دڵداری خۆی
ڕووڕەشم گەر من لە ڕێتا، تەرکی ڕۆح و سەر نەکەم. ئەحمەد موختار ـ

ئیدی مەڕۆ، دەفەری دڵم لە بۆنی بەهەشت مەحرووم مەکە!

تۆ بڕۆی، کانییەك نامێنێ، ڕێبوارێك دەمی پێ تەڕکا!

دەتەوێ لە بوخچەکەتدا، هەورەکان بپێچیتەوەو ئەستێرەکان بدەیتەوە دەست دەیجوور؟!

ئیدی شەوانە کێ بە حیکایەتی ئەوینو لایلایەی شیعر بمخەوێنێ؟!

لە سەحەرا کێ بانگمکاو بە سڵاوێکی بەهەشتی بێدارم کا؟!

ناکرێ، ئازیزم ناکرێ، من بەرگەی هیجرانی تۆ ناگرم!

گەردو بادی هیجری تۆ، وا عالەمی لێ کردمە تۆز
نەك دوو چاوم، بەڵکە حەتتا، دڵ غوباری گرتووە ـ نالی ـ

ئەو کاتەی دەگەی بەو کەسەی کە هەموو کەستە!

ئەو کاتەی دەستت دەگاتە دامێنی ئەو مورشیدەی کە ڕابەری ڕۆحو گەنجینەی دڵو ئاسمانی هیواو باوەشی ئەوینو دەریای مەحەببەتو هەمیشەبەهاری تەمەنتە..

ئەو کاتەی دەگەیتە مونتەهای ئەمەلو موبتەغای ساڵەهای ساڵی تەمەن!

ئیدی کەست بیر نامێنێ، لە یادی ئەودا، هەموو مەوجوودات دەتوێتەوە.

لە جەمالی ئەودا، دەگەیتە کەماڵێك؛ کە پاشاکان بە هیوای تۆزی گەردی ژێر پێی ئەو شۆخە، خەونی غوڵامی دەبینن!

ئیدی تا دەگەڕێینەوە، بۆ بەهەشتی ئەزەلی، باسی ڕۆیشتن مەکە، شاگوڵی فیردەوسەکەم!

من جگە لە تۆ، کەسی دیم لا مەتڵەب نییە!

با خەڵکی بێژن تەنیاو بێکەسە
مەیلی تۆم تەنیا، لە عالەم بەسە . کەمەندی .

گەرمیانی

نامەی چل و دوو

# نامە نوورسیەکان



نیوەڕۆیەکی گەرمە، سەرەتا ڕۆژەکانی مانگی پیرۆزی ڕەمەزانە، گڕەی هاوین وەك هەڵاوی ئاگر، سیمای ڕوخسار دەژاکێنێ!

بە لێوی وشكو سەری كزو هەنگاوی وردەوە، پۆل پۆل خۆشەویستانی خودا، بەرەو دیوانی دڵو قیبلەی ئەوین، هەنگاو دەنێن!

کاروانی خەیاڵ، بەرەو کوچەو کۆڵانی مەدینەی مونەووەرەی بردم، ئەو ڕۆژانەی کە پەروانەکانی دەوری شەمی درەوشاوە، چۆن بە گەرووی وشكو ڕەنگی زەردو سکی برسیەوە، لە دوای پەیامبەری نازدارەوە، نوێژی ڕۆحو سەفی بەندایەتییان دادەبەست، دەچوونە نێو دەفەری نوورو فرمێسکەکانیان لەسەر خۆڵی مەدینە، گەورەترین ڕۆمانی ئەوینو تاسەی خۆشەویستییان تۆمار دەکرد!

فەرشی مزگەوتی مەدینە خۆڵ بوو، وەلێ لای ئەوان، فەرشی فیردەوسو میسكو زەعفەرانی جەننەت بوو!

سەقفی مزگەوت پەلکەخورما بوو، وەلێ ئەوان لەژێر سێبەری عەرشدا، واژۆیان لەسەر گرێبەستی ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ دەکرد!!

بەڕۆژووبوون، بەڵام نەیاندەزانی ئێوارە بە چی فتار دەکەن؟ چی دەخۆن!

چونکە ئەوان، خەیاڵیان لای بەربانگ نەبوو، بەڵکو خەیاڵیان لای ڕەزامەندی ئەو خودایە بوو، کەتا ئەو فەرمان نەکا، لێو ناخەنە سەر لێوی پەرداخە ئاوێك!!

ئەوان چێژی خۆشەویستی خودا، هەموو شتێکی لەیاد بردبوونەوە!

ع. ش. شێرکۆ

حارسی موحاسیبی دەڵێ: «ئەگەر خەڵکی هەستیان بە لەزەتی خۆشەویستیی خودا کردبا، ئەوا خواردنو خواردنەوەو تەماحی دنیایان کەم دەبوو، نابینن فریشتەکان، بە خۆشەویستیی خودا، هەموو شتێکیان فەرامۆش کردووە!

ئازیزم: ئێمە لە بەیانی ڕا، خەممان سفرەی بەربانگە، چی بکڕینو چی ئامادە بکەینو چی بخۆین!

وەستانی چەند خولەکێکمان لا زۆرە، لە نوێژی تەراویحدا، وەلێ کاتژمێرێک وەستانمان لە فرۆشگەیەکدا، یا بۆ کولێرەیەکی گەرم، زۆر پێ ئاساییە!

ڕۆژوو لای ئێمەو لای پێغەمبەرو یارانی، زۆر جیاوازە!

پێغەمبەر (درودو سڵاوی خودای لێ بێ) ئێواران جگە لە چەند دەنکە خورمایەک، هیچی دی بەدی نەدەکرد!

زۆر جار ئەوەشی دەست نەدەکەوت، تەنها بە قومە ئاوێک گەرووی وشکی تەڕ دەکرد!

لە دواییشدا دەیفەرموو: «ذَهَبَ الظَّمَأُ، وَابْتَلَّتِ الْعُرُوقُ»

تۆ لەسەر خوانی ئەوینداری ڕۆحتی، جگە لە پەرداخێ ئاو، چیت دەوێ!

شیرینکردنی نێودەم شتێکەو شیرینکردنی ڕۆح شتێکی دی!

تەڕکردنی لێو شتێکەو چەورکردنی گەدە شتێکی دی!

ئەوان بە دەنکە خورمایەک، دەبوونە میوانی فەرحەی ئیلاهی!

ئێمەش خۆزگە دەخوازین، لە جێگای خۆمان هەڵنەسینو بخۆین، هەر بخۆین، تا دەمرین!!

تاوس کوڕی کەیسان دەڵێت: شیرینیی دونیا، تاڵیی ئاخیرەتەو تاڵیی دونیاش شیرینی ئاخیرەتە!

ئێمە لەسەرەتای ڕەمەزان، خەمی خۆراکو خواردنی ڕەمەزانمانەو لە نیوەی بە دواوەش، خەمی جلو جەهازی جەژن!

ئاوا دەمانەوێت لە عوتەقای ڕەمەزان بین؟!!

سکاڵاش دەکەین کە هیچ شتێک تامی نەماوە، تەنانەت عیبادەتیش!

لە وەهیبی کوڕی وەردیان پرسی: ئەوەی تاوان ئەنجام بدات، تامی عیبادەت دەکا؟ گوتی: نەخێر، ئەوەش کە دەیەوێتو هێشتا نەشی کردووە!!

ئازیزم: ئەو هاوەڵە شەیداو ئەڤیندارانە، شەوان تا سەحەر، ئاوێتەی هەنسکو قوڵپی گریانو ناڵەو نرکەی نیوەشەو بوون، دواساتەکانی سەحەریش بە بەرۆکی تەڕو دەستی لەرزیوو گڕی تاسەوە، بە ئیستیغفار گوڵاوپڕژێنی ژوانی دڵیان دەکرد، لەگەڵ سەدای ﴿وَالْمُسْتَغْفِرِينَ بِالْأَسْحَارِ﴾دا، بە دوو سێ دەنکە خورماو جامێ ئاوی گۆزەیەکی گڵین، گرێیان لە دەروازەی هەموو ئارەزوو و شەهەواتیان دەداو جگە لە زیکرو یادی خودا، ئیدی سەرقاڵی هیچی دی نەدەبوون!

دەزانم خۆشەویستانی خودا، غەریبو نامۆن لەم سەردەمەدا، بەڵام هەروەکو پەیامبەر دەفەرموێ: «فَطُوبَى لِلْغُرَبَاءِ»

هەڵگرانی پەیامی نوور، خۆشەویستانی خوداو هەوادارانی ڕێگای ڕاستو سوننەتی پێغەمبەرو زاهیدانو دونیانەویستان، نامۆن!

زۆریش نامۆن .....

بەڵام ئەوەی خودای لەگەڵ بێ، نامۆ نییە، ئەوەی چاوی لە دەستی خودا بێ، بێکەس نییە، ئەوەی دڵی دابێتە دەست خودا، لە هیچی کەم نییە!

دەگێڕنەوە: کاتێک مووسا پێغەمبەر (درودو سڵاوی خودای لێ بێ) لە فیرعەون هەڵدێو ڕوو دەکاتە مەدیەن، بەو شێوەیەی کە خودا باسی دەکات، لە خودا دەپاڕێتەوەو دەفەرموێ: خودایە.. تەنیاو نەخۆشو نامۆم!

خودای گەورەش پێی فەرموو: ئەی مووسا.. تەنیا، ئەو کەسەیە کە هاودەمێکی وەک منی نەبێ!

نەخۆش، ئەو کەسەیە، کە شیفابەخشێکی وەک منی نەبێ!

نامۆ، ئەو کەسەیە، کە لە نێوان منو ئەودا، مامەڵەیەک نەبێ!

وریابە ئازیزم، وریابە؛ با تێکەڵ بە ئەهلی دونیا نەبین.. خۆ ئەمڕۆ، جگە لە ئەهلی دونیا، کەسی دی نابینرێ!

مەحوی دەڵێ:

ئەوەندەی ئەهلی دنیان ئەهلی دنیا، تاقە ڕۆژێ گەر
بە قەرنێ من ئەوەند ئەهلی خودا بم، دەبمە پێغەمبەر

بەڵام دەبێ ئێمە، هەر هەوڵی ئەوە بدەین، کە ئەهلی دنیا نەبین!

حەسەنی بەسری دەڵێ: باوەڕدار لە دونیادا، وەک ڕێبوارێکی نامۆیە، خەم ناخوا بۆ نزمی دنیاو کێبەرکێش ناکا لەبەرزی دنیادا، خەڵک لەو سەلامەتنو ئەمیش ماندووی دەستی نەفسی خۆیەتی.

پێغەمبەری نازداریش دەفەرموێ: ئایا پێتان بڵێم: پاشاکانی بەهەشت کێن؟!

هەموو سەرکزو لاوازێکی تۆزاوی، جلو بەرگی دڕاوو نەناسراو، بەڵام ئەگەر سوێند بخواو لە خودا داوا بکا، خودا سوێندەکەی بۆ جێبەجێ دەکا!!

# لەگەڵ «فەنایی» شاعیردا

شـاعیر ناوی مـەلا عەبدوڵڵای کوڕی مەلا موستـەفای کوڕی مەلاساڵحە، ناسراوە بە "مەلا عەبدوڵڵای کاتب".

سـاڵی ١٩٣٢ لە دێی گوڵوانی سـەر بە دەشـتی لاجانی کوردسـتانی ڕۆژهەڵات، چاوی بەدنیـا هەڵهێناوە. خوێندنی مەلایەتی تەواو کردووەو ئیجازەی لە زانستە شەرعییەکاندا وەرگرتووە

شاعیر، خاوەنی شیعری جوانو هەڵبەستی ناسکو پڕ لە سـۆزو ئەوینە، سـاڵی ٢٠٠٤ کۆچی دوایی کردووەو لە شاری هەولێر بەخاك سپێردراوە.

## کەشتیی نەجات

دوێـشـەو کـە دڵـبـەرم هـات، ئـاوی حـەیاتـی پـێ بـوو
دەورم کـە بـوو بـە تـۆفـان، کەشتیی نـەجاتـی پـێ بوو
کـە دیـم بـە لـێـوی وشـکـو زامـی دڵو دەروونـم
لـە دەشـتـی کـەربـەلادا، ئـاوی فـوراتـی پـێ بـوو
شـاباشـی مـەقـدەمـی ئـەو، نـەقـدی حـەیاتـە بـۆ من
ئـەو شـاهـ و شـاهـزادە هـاتـو خـەڵاتـی پـێ بـوو
زانـی کـە تـیفـلـەکـەی دڵ، تـووتـیـی مـیـزاجـە بـۆ ئـەو
قـوربـانـی دەسـتـو بـازووی، شـاخـی نـەبـاتـی پـێ بـوو
بـەزمـێ بـوو بـۆ (فـەنـایـی)، هـەر لـەحـزەیـێ نـەوایـێ
سـەرگـەرمـی زەوقو شـایـی، شـا بـوو، بـەراتـی پـێ بوو

*** *** ***

## جیهانو عەشقی یارێك

لە صەحنی گوڵشەنی حوسنا، هەموو ڕۆژێ بەهارێکە
لە هەر گۆشەی چەمەن، ڕەنگی جەماڵی نەونیگارێکە
کە لەیلم بێتە بازاڕی وەفا، بەو نازو غەمزەی خۆی
ئەبینی تەرمی مەدهۆشان، ئەڵێی ڕاوو شکارێکە
کە زوڵفی چین لەسر چینی، ئیحاطەی دا بە ڕوخساری
بە خەرقی عادە، وا دیارە کە هەر لەیلەو نەهارێکە
لە کونجی مەیکەدەی عەشقا، کە سالیك غەرقی ئەحواڵە
لە سەیری ڕێگەدا هەردەم مەقامێکەو هەوارێکە
بە هەر لوتکەو نشێوێکی جنوونا تێپەڕن یاران
ئەبینن بارەگایێکە، وە یا گۆڕو مەزارێکە
ئەوەی کوشتەی غەمی لەیلابوو، مەجنوونێکی تەنیا بوو
شەهیدی مەدرەسەی عەشقی گوڵی من، سەد هەزارێکە
ئەگەر مەعشووقە لەیلا بێ، ئەنیسی عاشقێکەو بەس
بەڵام لەم مەکتەبی ئێمە، جیهانەو عەشقی یارێکە
سەرم سوڕما لە میزانو تەرازووی عەقڵی ئەم خەڵکە
کە هەریەك وا خەریکی مامەڵەو بازاڕی شارێکە
جەنابی واعیزو موفتی کە سەرگەرمن بە قیلو قال
لە بازاڕی مەعانیدا، ئەسەف ئەفسانەوارێکە